

# مەلای رەش

نووسین و کۆکردنەوەی:

عەزیزی مەلای رەش

کوردستان چاپی یەکەم ۲۰۱۰

# زۆر سوپاس بۆ:

- کاك غەفوور مەخمووری- سکرتێری گشتیی YNDK ئەرکی چاپی خستە ئەستۆی خۆی.
- کاك قەرەنی جەمیل وێنەکەی کێشا.
- ئەوانەی لە کۆکردنەوەی هێندە بابەت یارمەتیان داوین.

**بنەماڵەی مەلای رەش**



* **مەلای ڕەش**
* **نووسین و کۆکردنەوەی: عەزیزی مەلای رەش**
* **پیت چنین و نەخشەسازی و بەرگ: کۆمپیوتەری دەریا**
* **تیراژ: ( ١٠٠٠ ) دانە**
* **چاپی یەکەم- هەولێر ٢٠١٠**
* **چاپ :چاپخانەی منارە- هەولێر ( ٠٧٥٠٤٤٥٦٢٩٧ )**

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٢٣٩٧ ) ساڵی ( ٢٠١٠ ) پێدراوە**

# پێشەکی

**غەفوور مەخمووری**

زۆر زاناو هۆنەرو کەسایەتی مەزنمان هەبوون بەهۆی نەنووسینەوەی مێژوو و ژیان و بەسەرهاتیان تەنها ناوەکانیان ماون و شاکارەکانیان فەوتاون، زانای گەورە (مەلا ئەحمەدی بانەیی) ناسراو بە (مەلای ڕەش) یەکێکە لەو زانا ئایینییە بلیمەتانەی کوردستان کە بەهۆی نەنووسینەوەی ژیان و فەوتانی نووسراوو بیرو بۆچوونە ئایینییەکانی تەنها ناوەکەیمان بۆ مابۆوە. (مەلای ڕەش) چ وەك زانایەکی ئاینی چ وەك کەسایەتییەکی ناسراوی دەشتی هەولێرو کوردستان خودان هەڵوێستی ڕاستگۆیانەو پێگەی کۆمەڵایەتی خۆی بووەو، بیرو بۆچوون و لێکدانەوەو فتواکانی بەهەند وەرگیراون و لە زۆر پرسدا یەکلایی کەرەوە بوون، مرۆڤێك بووە بەڕەشی گوتووە ڕەش و بە سپیش سپی.

مامۆستا (عەزیزی مەلای ڕەش) دەبووا زۆر زووتر ئەم کارەی ئەنجامدا بوواو ژیان و بەسەرهات و بۆچوون و لێکدانەوە ئایینییەکان و فتواکانی لەفەوتان ڕزگار بکردبوونایە، بەڵام دیارە هەر ئەوە کراوە، ئەنجامدانی ئەم کارەی

بەڕێزیان خزمەتێکی زۆر بەژیاندنەوەی بەشێکی ون بووی کاروانی زانستی ئایین لەکوردستان و خستنەڕووی راستی رێزگرتنی دانیشتوانی دەشتی هەولێر لەزانایانی ئایینی دەخاتەڕوو.

ئەم بەرهەمەی مامۆستا (عەزیزی مەلای رەش) شایانی ئەوەیە لەکۆڕی ئایین و لەلایەن زانایانی ئایینی ئیسلام بەچاوی رێزگرتن لێی بڕوانریێ و بە بایەخەوە بخوێنرێتەوەو سوودی لێوەربگیرێت بۆ نووسینەوەی زۆر لایەنی تری ئەم بوارە لەکوردستان، لەبەر ئەوەی لەرابردوودا زانایانی کورد جگە لە خزمەتکردنی ئایینی ئیسلام خزمەتێکی زۆری کۆمەڵگای کوردەوارییان کردووە لەبواری خوێندن و بڵاوکردنەوەی زانست و رۆشنبیری و چارەسەرکردنی گرفتە کۆمەڵایەتییەکان و رێ نیشاندەر بوون بۆ سەردەمی خۆیان و تائێستاش ئەو کاریگەرییەیان هەر ماوە، بۆیە ئەو مێژووە بۆتە بەشێك لەمێژووی خوێندن و بڵاوبوونەوەی زانست و زانیاری لەکوردستان و هەق نییە فەرامۆش بکرێ، ئاوڕدانەوە لەو مێژووە ئەرکێکی نەتەوەیی و نیشتمانی و ئایینییەو، ئەو کارەی مامۆستا (عەزیزی مەلای رەش)یش سەرەتایەکە بۆ زیندووکردنەوەی ئەو مێژووە.

٢٠١٠/١٠/١٠

**هەولێر- باشووری کوردستان**

# مەلای ڕەش

ناوی (ئەحمەد ڕەحیم موحەمەد) بووە. ساڵی (١٨٩٦)ی زایینی لەئاوایی (پاشبەرد)ی سەر بەشارۆچکەی پێنجوێن لەپارێزگای سلێمانی دونیای ڕۆشەنی بینیوە.

ئەوسا خەڵکی گوندەکەی بۆ کڕینی کەلوپەلی پێویستی ژیان دەچوونە شاری (بانە)ی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی داگیرکراو. بۆیە کە چووەتە دەشتی هەولێر گوتوویەتی (خەڵکی شاری بانە)مە. زۆر جاریش لێی بیستراوە: (خەڵکی شارێکم دوو حەرفی: موسبەت و مەنفی). واتا (با) موسبەتەو (نە) مەنفیە.

بنەماڵەکەی مەلا زادە بوونەو بە نەوە دوای (ڕەحیم موحەمەد) حەوت پشت: (مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا ئەحمەد) دێت. پێنجەمین (مەلا ئەحمەد) بە مەلا ئەحمەدی گەورە مەشهوور بووەو بەدەست خەتی خۆی لەبەرگی کتێبێکی خۆی نووسیووە دەچێتەوە سەر (مەلا موسای تەوەکەلی). لەدوای ئەویش مەلا ئەحمەدی حەوتەم لەژێر نووسینەکەی سەرەوەی نووسیووە: (من مەلا ئەحمەدی حەوتەم)م.

(من ئەمەم لە باوکی خۆم بیستووە.. نووسەر)، کەچی نووسینەکان بەرسووتانی کتێبخانەکە دەکەوێت. لەدواییدا باس دەکرێت. بنەماڵەکەی کتێبخانەیەکی یەکجار گەورەی دەبێت.

لە تەمەنی حەوت ساڵیدا دایك و باوکی وەفات دەکەن. سێ براو خۆشکێکی بە مێردی دەبێت. برایەکی (ئەمین)ی ناو بووە زوو ئەمری خوا دەکات. نە زاندراوە لەخۆی گەورەتر بووە، یان بچووك تر. دووەکەی تر (حەمە شەریف و حەمە ساڵح) گچکەتر بوونە.

هەر یەك لە براکانی دەچێتە لای مامێکی. بەخۆشی خاڵۆی باوکی (مەلا ئەحمەد)ی ناو بووە دەیباتە لای خۆی. کەچی زۆر نابات یەك لە مامەکانی

(حەمەسالْح)ی برای دەردەکات. خوشکەکەیان هەرکە دەزانێت ماڵە مێردی بەجیٚ دێلێت و لەسەریاندا دادەنیشێت.

خۆی شێوەی لە (سەید عەیشیٚ)ی دایکی ڕەش و کورتەڵە بووە، چووە. بۆیە (ڕەش)ی بەدواکەوتووە. باوکیشی سپی و سوورو چاوشین و بەجەم بووە.

خاڵۆکەی لە تەماعی کتێبەکان، کە لای دەبن پێی خۆش نابێت بخوێنێت.

سودفە کۆلکە مەلایەکی دێیەکەیان نەوەت و نۆ ناوی خوای مەزن (ئەسمائوللا) دەنووستەوەو دوو سیٚ ڕۆژان لە مزگەوت، بە هات و چۆکردن و دەنگی بەرزەوە بۆ دەرخ کردن دەوریان دەکاتەوە. ئەویش بەهرەیەکی وای هەبووە، دوو جار نا، سیٚ جار شتێکی بەرگویٚ بکەوتبووایە دەهاتەبەری و لەبیریشی نەدەچووەوە.

ڕۆژێک بە کۆلکە مەلایەکە دەڵێت: (مامۆستا ئەوەی چەند ڕۆژەی دەوریان دەکەیتەوە بۆتی بڵێم).

مەلاش بەسەرسوڕمانەوە دەڵێت:

– دەبڵی ئەگەر درۆناکەیت!.

ناوەکان زۆر بەڕێکی و ڕەوانی بۆ مەلا دەڵێت.

مەلا هەرکە ئەو بەهرەیەی لێدەبینێت و بنەماڵەکەشیان مەلازادە بوونە، هەستی ئایینی و مرۆڤایەتی هانیدەدات شەوان بەدزی خاڵۆکەی دەرسی پێدەڵێت. قورئانی پیرۆز بە شەش مانگ خەتم دەکات. ئەوسا دەچێتە ناو فەقێیان. لەبەر گچکەیی فەقێکانی هاوڕێی تەعلیقی لێدەدەن و دەڵێن: (دەبیٚ لانکێکت بۆ پەیدا بکەین).

هەرکە دەگاتە کتێبی (جامی) کتێبەکان لە خاڵۆی دەستێنێتەوە. بەو کتێبانە دەبێتە مەلا، بەداخەوە ساڵی (١٩١٦) سوپای ڕووس دەگاتە ناوچەکەو کتێبخانەکە دەسووتێنێت.

مەلا (نەسروڵڵا) ناوێک لەکاتی ئاگرگرتنی کتێبخانەکە، کتێبێکی زۆر دەرباز دەکات. پاشدان زەفتیان دەکات و نایداتەوە بنەماڵەکە. لەدواییدا کچێکی خۆی لە تۆڵەدا، دەداتە کوڕێکی حەمەشەریفی برای. ئێستاش ژنەکە لەژیاندا ماوەو نەوەیەکی زۆری لێکەوتووەتەوە.

جگە لە زیرەکییەکەی زۆر ساعیش بووە. پێش ئەوەی کتێبی (موختەسەر) تەواو بکات نزیکەی بیست جار کتێبی (جامی) بەبەرد گوتووەتەوە. واتە بەردێکی کردووەتە فەقێ و دەرسی پێ گوتووە.

لەناوچەی (مەریوان و موکوریان و هەورامان) هەر مەلایەك عیلمێکی باشی زانیبێت چووەتە لای و عیلمەکەی لاخوێندووە.

ئەمەش ناوی هێندێك لە مامۆستایانی:

١- حاجی مەلا عەبدوڵڵا لەگوندی کانی سانان.

٢- سەید موحەمەدی چۆڕی، لەدێی چۆڕ.

٣- مەلا مەحموودی جوانڕۆیی لە (باڵك) گوندێکە لەولای مەریوان.

٤- مەلا عەبدولقادری مودەڕیس لە بیارە.

٥- حاجی مەلا عەبدوڵڵای پەسوێ لە موکریان.

٦- مەلا عەبدوڵڵای وەڵزی لە دووڕووە.

هەرکە مەلایەتی تەواو دەکات خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا (عەبدولقادر)ی بیارە ئیجازەی مەلایەتی دەداتێ و زۆر نابات وەفات دەکات.

خوالێخۆشبوو (شێخ عەلائەدین)ی بیارە ساڵی (١٣٣٩-١٩٢١) دەیکاتە مەلا لەجێگەی مامۆستاکەی.



# پایەبەرزی

ئەمەم چەند جار لەباوکی خۆم بەرگوی کەوتووە: نووسەر (هەرکە لە بیارەی شەریف بە مەلا دامەزرام ڕەبەن بووم. نووستن و خواردنم لەگەڵ فەقێیان بوو. شەوێك، نەشەوی جومعە بوو، نەشەوی سێشەممە، فەقێکان دەستیان بە بەستەو گۆرانی کرد. پیاوی خوالێخۆشبوو شێخ عەلائەدین هات و گوتی: (شێخ دەفەرموێت بەیانی دەرستان نییە؟). منیش بە تەوسەوە گوتم: (نەخێر نیتمان).

پیاوەکە ڕۆیشتو هاتەوەو گوتی:

– شێخ دەفەرموویێت کە دەرس نییە لێرە چدەکەن.

گوتم: (ئێرە تەکیەی شێخ عەبدوڵلای دەهلەوییە، ئێمە فەقێو مەلاین رازین لێرەین، رازی نینە سبەی دەچینە جێیەکی تر).

بۆ بەیانی شێخ جوابی نارد نیوەڕۆ دەعوەتی منن.

کە چووین جەنابی شێخ لە تەمەندا بە باپیری من دەشکاو لەدوورەوە بەپیرمەوە هاتو ما ئەملاو ئەولام ماچ بکاتو گوتی:

– (مەلا ئەحمەد من کردم تۆ نەیکەیت. مەلا ئەحمەد من کردم تۆ نەیکەیت).



# هەڵقەنانی لە بیارە

کوڕی مامۆستاکەی مەلایەکی باش نابێتو چاوی لە جێگەی باوکی دەبێت.

مەلای ڕەشیش دەڵێت: (من بەناو بۆ خوا دەرس دەڵێمەوە، ئەوەی مامۆستام لەسەر جێگەی مەلایەتی لێم دڵگیر ببێت خێرەکەم چۆن دەبێت).

حوجرەی بیارە ئەوسا باشترین شوێن بووە لەپارێزگای سلێمانی بۆ تەدریس کردن، ناچار بە خۆو فەقێوە ساڵی (١٣٤٠) کۆچی روو لەشاری سلێمانی دەکات. ئەو بەڕێزانە موستەعیدی دەبن (مامۆستا مەلا ڕەشیدی موکریانیو مامۆستا مەلا عەبدوڵلای چرۆستانیو مامۆستا مەلا عەلی عەودالانو مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی موەدریس)و چەندی تر ناویان لەیادکراوە.

میوانی حوجرەی خوالێخۆشبوو: (شێخ عومەری قەرەداخی) دەبن. ئەوکاتەی شێخی تایەن تەواو دەکاتو دەیەوێت ببێتە مەلا ئەو مندالْ دەبێتو (تەسریفی زنجانی) دەخوێنێت. ڕووی تێدەکاتو دفەرموویێت:

– مەلای ڕەش تۆ تازە خوێندنت تەواو کردووە، من تا ئەمڕۆ هەر تەدریسم کردووە.

- قوربان چ تەدریس و چ خوێندن هەر زانین نییە.

ئێوارە مەولوود.. دەبێت. جەنابی شێخ قەرەداخی بۆ ڕێزلێنان دەڵێت:

- دەبێ مەلای ڕەش مەولوودەکە بخوێنیتەوە.

مەولوودنامەکە دەست خەتێکی هەورامی زۆر ناخۆش دەبێت و کەم کەس بۆی دەخوێندرایەوە.

هەرکە مەلای ڕەش مەولوودەکە دەخوێنێتەوەو ناوە ناوە پەڕێکی ئاوا دەکرد.. شێخ زەردە دایدەگرێت. چونکە شارەزای مەولوودنامەکە دەبێت و دەیزانی ئەو شوێنەی دەخوێنێتەوە لەگەڵ پەڕ ئاواکردنەکە یەك ناگرێتەوە. دوای تەواو بوونی مەولوودەکە شێخ دەفەرمووێت:

- مەلای ڕەش چیت لە مەولوودنامەکە زانی؟.

- نەخێر قوربان.

- ئەدی ئەوەی خوێندتەوە چ بوو؟.

- قوربان من هەر شتێك سێ جاری بخوێنمەوە دێتە بەرم. بیست جاریشم زیاتر مەولوود خوێندووەتەوە.

پاشدان دەڵێت:

- قوربان ئاواتەکەت نەهاتەدی.

- ئاواتی چی؟!.

- شکاندنەوەی من بوو لەو مەجلیسە، بەهۆی نەزانینی مەولوود نامەکە.

- نەخێر بەسەهوو چوویت. مەبەستی من تەنیا ڕێزلێنان و خۆشەویستی بوو.

جەنابی شێخ هەوڵ دەدات فەقێکانی بۆ خۆی بگێڕێتەوە: (مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای چرۆستانی و مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس) دەگەڕێنەوە.

مەلای ڕەش ڕوو لەگوندی (عەودالان) دەکات. پاش چەند مانگێك دەچێتە ئاوایی (گەلاڵە). بۆ ئەوەی لایان نەڕوات خەڵکەکە ویستیان کچی کوێخای گوندەکەی بدەنێ. کەچی کیژەکە دەڵێت: (کەس نازانێت: ئەو مەلا عەجەمە چ کەسەو مێردی پێناکەم).

●●●●●

دوای بەیانی (١١/ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠)دا پیاوێکی ڕێکو پێکو بەهەیبەتم لە حاجی ئۆمەران دیت: (بەداخەوە ناوەکەیم لەبیر نەماوە) گوتی (خەڵکی گوندی گەلاڵەی لای سلێمانیمە).

منیش گوتم: (باوکم چەند مانگێك مەلایەتی ئێوەی کردووە).

گوتی: (کێیە؟).

- مەلا ئەحمەدی ڕەش.

گوتی: (ئەهۆ.. وەهە.. کچی کۆخاکەمان مێردی پێنەکرد. بۆیە ڕۆیشت. خەڵکی ئاوایی لێکرا سەرکۆنەیان کردو قسەی ناشیرینیان پێوت. لەئەنجامیشدا کچە تووشی نەخۆشی (سیل.. وەرەم) بوو..و بەکچێتی سەری نایەوە).

پاشدان گوتی: (ئەگەر مێردی پێ بکردبووایە ئێستا خوارزای وەك جەنابتمان دەبوو- نووسەر).



# ڕەو کردنی بەرەو دەشتی هەولێر

لە گەڵاڵەوە یەکسەر بەرەو دەشتی هەولێر هەیپەی لێدەکات.

ئەوسا ناوچەکە خزمەتی مەلایان یەکجار زۆر دەکرد. گوند هەبووە ساڵانە بیست.. سی بەردیلە زەکاتی دەدا مەلا.

لەشارۆچکەی پردێ میوانی فەقێیان دەبن. خوالێخۆشبوو مامۆستا (مەلا عەلی رواندز) مەلا دەبێت.

خوالێخۆشبوو: (مامۆستا مەلا سەعیدی باشتەپە) موستەعید دەبێت و ڕوو لە مەلای ڕەش دەکات و:

- مەلا ئەحمەد نیازت چییە؟.

- دەمەوێت لەو دەشتەی هەولێر ببمە مەلا.

ئەویش دەڵێت: (دەفەوتییێت).

- لەبەر چی؟.

- من مەلامە نازانم تۆ مەلایت. بەهۆی گفتوگۆ لەگەڵ فەقێکانتەوە هەموویان مەلانە زانیم جەنابیشت مەلا باشیت، بەڵام خەڵکی نەخوێندەواری دێهات چۆن دەزانن تۆ مەلایت و فەقێ چۆن دێنە لات.

بۆچوونەکەی تەواو لەدڵ سەقا دەدرێت و ناچار دەڵێت:

- ئەی تەکبیر چییە!؟.

- ئەگەر دەتەوێت ئەو عیلمەی هەتە نەفەوتێت و بەزووترین کات ناودەرکەیت و هەرچی فەقێی باشی ناوچەکەیە ڕووت تێ بکەن بڕۆ چەند مانگێک لای (مەلا ئەفەندی) هەولێر بخوێنە ئەو بەس مەدحت بکات یەکسەر ناوو شوورەت دەردەکەویت.

خۆی هەروەک باس کرا لەسەر دەستی (مامۆستا مەلا عەبدولقادری بیارە) ئیجازەی وەرگرتبوو. لەنێو فەقێیانیش دوو ئیجازە وەرگرتن بەکاری دزێوو.. ناهەموار لەقەڵەم دەدرا. کەچی خۆشەویستی عیلمەکەی هانی دەدات گوێ بەو عەیبە

نـەدات و بەقـسەی دەکـات و ڕوو لەشـاری هـەولێر دەکـەن. شـەو دەگەنـە ئـاوایی (گردمـەلا)و میـوانی خوالێخۆشـبوو (مـەحموودی کاکـەخان) دەبـن. ئەوسـا خوالێخۆشبوو (عەلی مەحموود کاکەخان) تازە هەڵدەهات.

ڕۆژی دوایی ساڵی (١٩٢٤) دەگەنە شاری هەولێرو میوانی تەکیەی خوالێخۆشبوو (شێخ موستەفا) دەبن.

پارچـە حەسـیرێك لەسـەر حـەوزی مزگەوتەکـە دەبێـت مـەلای ڕەش لەسـەری دادەنیـشێت. مەلایـەك لەحەوشـەی تەکییەکـە حەسـیرەکەی لـەژێر دەردەهێنێـت و بـۆ خۆی لەسەری دادەنیشێت. ئەویش زۆر پێ دڵ گران دەبێت، بەڵام دەنگ ناکات.

کچێکی جەنابی شێخ موستەفا ئەمری خوای کردبوو، تازییەدار بوون.



# دەست بەخوێندن کردنەوە

خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا ڕەشیدی موکریانی لەمنداڵیەوە بەیەکەوە دەخوێنن. بـەهۆی گـوزەرانی خێزانییـەوە ئـەو واز لەخوێنـدن دەهێنێـت. پـاش دوو سـێ سـاڵان مەلای ڕەش دەچێیتە لای و پێدەڵێت: (ڕەشید وەرە دەست بە خوێندن بکەوە).

ئـەویش بـەگوێی دەکـات و لـەو کتێبـەی بـەجێی هێـشتبوو دەرسـی پێـدەڵێت و بـۆ ئەوەی ئەوانی پێشتری بێتەوە بیر.. ڕۆژ بەڕۆژ وەك خوێندن لەگەڵی پێدادەچێتەوە تا دەبێتـە مەلایـەکی بـاش. خوالێخۆشـبوو.. وەزیـری دەسـتە ڕاسـتی بـووە. بـەخۆی لەژیانـدا فـەقیرحاڵ بـووە. کەچـی ئـەو زەمـان زان و لـەکاروباری ژیانـدا لێـزان و چاپوك بووە. بە جەنابی شێخ موستەفا دەڵێت:

– قوربـان ئـەوە باشـترین مـەلای سـەردەمەو هاتووەتـە ناوچەکە ببێتـە مـەلا، بەڵام کـەس نایناسـێت و عیلمەکـەی دەفـەوتێت. وابکـە جـەنابی ئەفەنـدی چـەند مانگێـك دەرسی پێ بڵێت و بزانێت مەلا باشەو مەدحی بکات و لەناوچەکە ناودەربکات.

ئەویش دەفەرموویێت:

- ئەفەندی ئێستا دێتە تازییەو عەرزی دەکەم.

جەنابی ئەفەندی لە فەقێیان تووڕە بووبوو.. ماوەیەك بوو فەقێی ڕانەدەگرت. هەرکە دەچێتە تازییەکە پێیدەڵێت: (دەرس بەو مەلایە، کە لەشاری بانەی ئێرانەوە هاتووە بڵێ حوجرەکەت وەك جاران ئاوەدان دەبێتەوە).

جەنابی ئەفەندی ڕووی تێدەکات و دەڵێت:

- مەلا ئەحمەد من بەس فەلسەفەو ڕیازیات دەڵێمەوە.

ئەویش هەردووکی خوێندبوو..و کەچی دەڵێت:

- قوربان منیش هەر ئەو دوو دەخوێنم.

ئەمەش لەساڵی (١٣٤٣-١٩٢٤) دادەبێت.

هەرکە جەنابی ئەفەندی لە تازییەکە هەڵدەستێت، مامۆستا مەلا ڕەشید بە شێخ دەڵێت:

- یا شێخ پێمان نەگوت: ئێمە کۆمەڵە فەقێیەکین.

ئەویش دەفەرموێت:

- حوجرەی ئەفەندی وەك تەکییە وایەو حسێبی ئەوەی دەڵێیت لێناکرێت.

هەموو ڕۆژ تێرکە نانێکی گەنم لەگوندی (باداوان)، ماڵی ئەفەندی لێبوو، دەناردە قەڵات و نیوەی بۆ فەقێیان و نیوەکەی تر بۆ دەست و پێوەندەکانی ئەفەندی.

خەڵکی قەڵاتی هەولێر ئەوسا بەیانی و نیوەڕۆ..و ئێواران چێیان دەخوارد فەقێکانیش ئەویان دەخوارد. هەموو ڕۆژی جومعانیش مەڕێك سەردەبڕاو نیوە بۆ دەست و پێوەندەکان و نیوەکەی تریش بۆ فەقێیان.

مەلای ڕەش هەرکە لەقەڵات دامەزرا هەموو ڕۆژێ دەچووە تەکیەی شێخ موستەفاو دەیگوتە مەلاکەی حەسیری لەبن دەرهێنابوو: (مەلا پرسیارێکی شەرعی، یان عیلمیم لێ بکە).

ئەویش پرسیارەکەی دەکردو دوای وەڵامدانەوە، لەسەر ڕاڤەکردنی پرسیارەکە، پرسیاری لە مەلاکە دەکردو دەیهێناو دەیبرد هەتا دەیگوت: (نازانم). دوای سێیەمین ڕۆژ بەم شێوەیە. مەلاکە ئەوسا پڕدەداتە ماچ کردنی دەستی و دەڵێت:

- مامۆستا لێم ببوورە لاموا بوویت سۆفیەکی نەخوێندەواریتو نەمزانی ئەو نەوعە مەلایەت.

چونکە ڕیشی هەبوو.



## جگەرە بڕان

مامۆستا مەلا ڕەشید جگەرەکێش بوو. کەچی کە جگەرەی نەدەما، بەخۆی دەوەستاو دەیگوت: (جگەرە ناکێشم).

مەلای ڕەش بەخۆی نەدەوەستا. هەرکە بۆ جگەرە تەنگاو دەبوو مامۆستا مەلا ڕەشید لەدەوروبەری مزگەوتی قەڵات قونگە جگەرەی خڕ دەکردەوەو (پەڕە) جغارەی هەبوو دەیکردە جگەرەیەكو دەیدایەو کە دەیگوت (لەکوێت بوو؟).

دەیگوت: (خوا ناردی).

پاش جێگیر بوونیان لە مزگەوتی قەڵات، ناوبراو ڕۆژێ بەقۆدییە جگەرەیەك دەرسی بە خوالێخۆشبوو (ڕەشاد موفتی) دەگوت.



## کەواو سەڵتە

ڕۆژێك جەنابی ئەفەندی دەبینێت مەلای ڕەش شمەکی بەری کۆنەو پارە دەداتە مامۆستا مەلا ڕەشید کەواو سەلتەی بۆ بکڕێت:

ئەویش کەواو سەلتەیەکی خراپ دەکڕێت.

جەنابی ئەفەندی دەڵێت:

- ڕەشید من پارەی ئەو کەواو سەلتەیەم دا تۆ؟.

- نەخێر قوربان. بە ئەنقەست ئەو خراپەم کڕی تاکو هێندە پارە بمینێتەوە بە جگەرەی بدەین.

- کەواتە ئەوە پارە کەواو سەلتەیەکی باشی بۆ بکڕەو ئەو خراپەش بۆ جگەرە بفرۆشەوە.



## ڕەشاد موفتی

خوالێخۆشبوو (مامۆستا ڕەشاد موفتی) فەرمووی: ((باوکت کە لای جەنابی ئەفەندی دەخوێندو: دەرسی (گەلەنبەوی‌و جەمعول جەوامیعی)ی بە فەقێیان دەگوت، ڕۆژێك گوێم لێبوو دەوری کتێبی (سەمەدیە)ی، کە کتێبێکی نەحوەو لەکاتی سوختاتی، پێش کتێبی (جامی) دەخوێندرێت، دەکاتەوە. منیش پێمگوت: (مامۆستا جەنابت: دەورکردنەوەی سەمەدیەیان نەگوتووە).

ئەویش گوتی: ئەگەر منداڵێکی وەك تۆ پرسیارێکی لەو کتێبە لێکردم نەمزانی- نووسەر)).



## جەنابی مەلای کۆیە

ڕۆژێك خوالێخۆشبوو جەنابی مامۆستا (مەلا موحەمەدی کۆیی) میوانی مەلا ئەفەندی دەبێت. مەلای ڕەش ئەوسا کتێبی (گەلەنبەوی بورهان) بەفەقێکانی دەڵێت. بەئەنقەست نزیکەی نیو سەعات هەست رادەگرێت. بە ئەفەندی دەڵێت:

- ئەوە کێیە؟.
- فەقێمە.
- کوڕە، ئەوە، وەك من‌و جەنابت مەلایە!.
- بەڵێ مەلایە، بەڵام ئیشی پێمە.



لەسەرەتای حەفتاكانی سەدەی ڕابردوودا لەقوتابخانەی (١١/ی ئازار)ی گەڕەكی مەنتكاوە، مامۆستا بووم. خوالێخۆشبوو مامۆستا (مەلا عومەر)ێكی ڕەنگ سووروو سپیو چاوی تەواونە بوو، كە منی ناسیو گوتی:

– باوكت لای ئەفەندی دەیخوێند. من لەوێ سوختە بووم. جەنابی ئەفەندی لەكاتی دەرس گوتنەوەدا هەر شەرحی دەكردو باوكیشت هەر دەیگوت (بەڵێ). ڕۆژێك پێیدەڵێت: (مەلا ئەحمەد بۆ پرسیارێك ناكەیت؟).

ئەویش گوتی: (قوربان پێم خۆشە گوێ لە تەقریرەكەت بگرم).

– نا.. پێم خۆشە پرسیارم لێ بكەیت.

پرسیارێكی لەدەرسەكە لێدەكات چێشتان بوو تا نیوەڕۆ یەكتریان هێناوبرد.

ئێمەی فەقێش هەموومان بەسوختەو موستەعیدەوە لەدیاریانەوە وەستابووین تا دەرسەكە تەواو بوو.

باوكت گوتی: (قوربان من شەرحی كتێبەكەم پێویست نییە. بەس پێم خۆشە گوێم لە تەقریرەكەی جەنابت بێت).

– باوكم زۆر جار دەیگوت: (سیپارەشم لای بخوێندبووایە سوودم لێوەردەگرت).

جەنابی ئەفەندیش باوەڕی زۆر پێ بوو. لەدواییدا باسی دەكەین– نووسەر.



# ئیجازەی دووەم

پاش نۆ مانگ خوێندن بۆ ئەوەی مەرامەكەی كە ناوودەنگە بێتەدی جەنابی ئەفەندی لەكاتی ئیجازەدانی، لەدوای هەرچی پیاوی ناودارو بەدینی شاری هەولێرو دەوروبەری بوو دەگێڕتەوە. بەم تەرزە مەدحی دەكاتو دەڵێت:

– من ئەوەندە ئیجازەی داوە، مەلای باشی وەك ئەو مەلا ئەحمەدەم نەهاتووەتەلا.

خوالێخۆشبوو (مەلا سەعیدی سمێڵ سۆر) باوەڕپێكراوی ئەفەندیو قەڵەمداری گوندی (جدیدەو منارەو مەلاقەرە)و چەند دێی تر دەبێت، لەعەشیرەتی ساڵەیی و

نیشتەجێی ئاوایی (قەرەبەگ) بووەو لەگەڵ (مەلا عەیشان)ی دایکی مەلا ئەحمەدی قەرەبەگ لەنەوەی (مەلا تەها)ی دێی (ئاومال)ینە. پاشدان دەچێتە قەرەبەگو هەزار دۆنم زەوی لە خەڵکەکە دەکڕێت.

دوای مەدحەکە دەڵێت:

– مادام ئەو مەلا باشەیە ئەوا من کچی خۆم پێشکەش کرد.

ئەویش لەماوەی ئەو نۆ مانگەدا دەیناسێت: پیاوێکی باشو بەدینە دەڵێت:

– کچ کچی تۆ بێت شەل بێت، کوێر بێت ئەوا قەبووڵم کرد.

خوالێخۆشبوو (موشیری ئیبراهیم ئاغا)ی قەزای (مەخموور) ئەوسا حاکم دەبێتو دەڵێت:

– منیش ئەوا چل لیرەمدا بۆ جیهازی بووکو ماڵ پێکەوەنانو کردمە: مەلاش لە مەخموور.

ئەوسا دوو سەیارە لەشاری هەولێر دەبن. یەك هی ئەفەندیو ئەویتریش هی موشیر. ژنی بە توڕمبێلی موشیر لەقەلاتی هەولێر بۆ مەخموور دەگوازرێتەوە. ئەمەش لەساڵی (١٩٢٥)دا دەبێت.

ژنی موشیرو قائیمقامو معاون شورتە هەرکە بووك دەبینن سوورو سپیو جوانە دەڵێن:

– لە قەلات هاتووەو دەرمانی لەخۆ داوە.

بۆ تەجروبە پەڕۆی بەڕووی دادەهێنن سوورتر هەڵدەگەڕێت.



# پەیوەندی

بەماوەی ئەو نۆ مانگەی مەلای ڕەش لەشاری هەولێرێ خوێند پەیوەندی لەگەڵ زۆربەی کەسانی ناودارو بەرپرسانی شار پەیدا دەکات.

خوالێخۆشبوو: (حاجی مەحموود دێرەیی) ساڵێ دووقات، (کەواو سەلتەی) بۆ ڕەوانە دەکرد. یەك لەوەرزی گەرمادا ئەویتر لەوەرزی ساردیدا.

مەلای ڕەش هەتا مرد کەواو سەلتەی بۆ خۆ نەکڕی.

چەندین پیاوی ناوداری تر، بەڵام لەبەر درێژدا دری پشت گوێ خران.



# ناودەرکردن

بەهۆی مەدح و سەنا زۆرەکەی جەنابی ئەفەندییەوە مەلای ڕەش یەکسەر ناوو شورەت دەردەکات و کام موستەعیدی باش و زیرەك و بەناوبانگی شاری هەولێرو دەوروبەری دەبێت دەچنە لای دەخوێنن. وەك ئەو خوالێخۆشبووانە (مامۆستا مەلا ئەبووبەکری دووگردکان و مامۆستا مەلا موحەمەدئەمینی سوێری و مامۆستا مەلا موحەمەدی مەخموورو مامۆستا مەلا سەید غەفووری مەلاکاغاو بەدەیانی تر).



# پرس پێکردن

هەرکە ساڵی (١٩٢٥) بەخۆ..و فەقێیەکی زۆرەوە دەچێتە شارۆچکەی مەخموور لەدڵی خەڵکەکە دەچەسپێت مەلایەکی زۆر باشە، چەند کەسانی شارۆچکەکەو دەوروبەری، دەربارەی گوزەران و گیروگرفتی سەردەم پرسی پێدەکەن. لەبەر درێژ دادڕی تەنیا باسی یەکێکیان دەکەین.

– خوالێخۆشبوو: (کوێخا عەدۆی ئازیکەند) سەرۆکی عەشیرەتی بندیانان دەچێتە لای و دەڵێت:

– مامۆستا دەمەوێت سێ پرست پێ بکەم: بیان کەم یان.. نا؟.

– فەرموو.

یەکەم: پلکێکم ژنی پاشا دەبێت دەمەوێت داوای هەشتێکیەکەی بکەم.

دووەم: ماڵی پاشای داوام لێدەکەن زەویان بدەمی بەکریٚ تۆی بکەن.

سێیەم: داوادەکەن ڕێیان بدەم ساڵانە بەکریٚ مەڕیان لەوەرزی زستان بهێننە نێو پاوانی من.

مەلای ڕەش یەکسەر دەڵێت:

بەگوێی من دەکەیت دوورکەوتنەوەت لەگیرەی ماڵی پاشا لەبەرژەوەندی جەنابت دایە.

ئەویش بەسەرسوڕمانەوە دەڵێت:

– لۆ..؟!.

– یەکەم: گەر لەدادگا داوای حەقی پوورت بکەیت، سبەی ئەوان دەسەڵاتدارن. بە پارە دوو شاهید قیت دەکەنەوەو سوێند دەخۆن: (پاشا پێش مردنی ئەو ژنەی تەڵاق داوە).

دووەم: گەر زەوییەکەشت تۆ بکەن، پاش دوو سیٚ ساڵان دەڵێن: (داس بڕی خۆمانەو لەمەحکەمەش بەروەستیان نایەت).

سێیەم: پاوانەکەش هەر ئەوها.

کوێخا عەدۆ لەدووەمو سێیەم بەگوێی دەکات، کەچی لەیەکەمدا لەدادگادا چی دەسگیر نابێت: (نازانم هۆیەکەی چ بووە– نووسەر).



تێبینی:

(ماڵی پاشا بەرەبابێکن لە ئاغاواتی دزەیی).

## مەسەلەیەکی شەرعی

کابرایەك لەگوندی (برایم باول)ی ناوچەی قەراجو قەزای مەخموور جوتیار دەبێت. ڕۆژێك سوێند بە تەڵاق دەخوات بۆ ئاغاکەی نەچێتە جوت.

خوالێخۆشبوو (شێخ عەبدولکەریم)ی دارەخورمایی، کە گەورەترین شێخی تەریقەتی قادری بوو لەناوچەکە، ئەوسا ماڵی لەو دێیە دەبێت و لەگەڵ مەلاکانی ناوچەی قەراج دەڵێنە جوتیارەکە، لەبەر ئەوە منداڵت سەرکەو بنکەنەو ژیانیشت تەنیا لەسەر جوتیاریەکەیە بڕۆ جوت تەڵاقت ناکەوێت.

کابرای جوتیار دڵی ئاو ناخواتەوەو بەرگوێشی کەوتبوو: مەلایەکی باش هاتووەتەوە مەخموور دەچێتە لای.

مەلای ڕەش پێیدەڵێت: (تەڵاقت بەم ئەرزەی وتت خواردبێت بچێتە جوت دەکەوێت).

جوتیار دەڵێت:

– قوربان منداڵەکانم ساوانەو ژیانیشم لەسەر جوتیاریەکەیە.

– تۆ ئیمانت بە خوا هەیە؟.

– بەڵێ.

– مادام خوایەك منداڵی پێ بەخشیویت رزقیشیان هەر دەدات.

بەم فتوایە کێشە لەنێوان مەلای ڕەش و شێخ عەبدولکەریم و مەلایەکانی قەراج پەیدا دەبێت و شتاق لا بۆ یەکتر ناسەلمێنن. بیرو بۆچوونی هەردوولا دەکرێتە راپۆرتێك و خوالێخۆشبوو مامۆستا (مەلا ڕەشیدی موکریانی) راپۆرتەکەی بەپێیان بۆ جەنابی ئەفەندی دەبات و دەڵێت:

– قوربان کێشەیەك لەسەر مەسەلەیەکی تەڵاق خواردن لەنێوان مەلای ڕەش و شێخ عەبدولکەریم و مەلای گوندەکانی دەوروبەر بەرپابووە.

جەنابی ئەفەندی باوەڕی زۆر بە مەلایەتی مەلای ڕەش بووە یەکسەر دەڵێت:

– مەلای ڕەش چ دەڵێت؟.

– دەڵێت: دەکەوێت.

– منیش دەڵێم: دەکەوێت.

مامۆستا مەلا ڕەشید لەگەڵ ڕاگرتنی راپۆرتەکە دەڵێت:

– قوربان ئەوە راپۆرتەکە سەیری بکە؟.

بەوپەڕی هەڵچوونەوە دەڵێت:

- ڕەشید!.

ئیتر یەکسەر دەگەڕێتەوەو قسەی مەلای ڕەش سەردەکەوێت.

کابرای جوتیار ناچار لەگوندەکە باردەکاتو دەچێتە دێی (شێخ شەروان)ی نزیك شاری هەولێر.

ئەوساڵە ناوچەی قەراج نەهات دەبێتو لەگوندە نوێیەکە دەغڵێکی زۆری لەنێوچەوانی مەلای ڕەشەوە دێت. لەپاداشتا هەموو ساڵێ کەڕەتێك دیدەنی دەکرد.



## بارکردن لەمەخموور

خوالێخۆشبوو: (موشیری ئیبراهیم ئاغا)ی شارۆچکەی مەخموور فێرە ئارەق خواردنەوە دەبێت.

مەلای ڕەش جارێك پێیدەڵێت: (ئاغا گەر ئارەق نەخوێت شەرتە هەتا یەکتر نەنێژین بەجێت نەهێڵم).

بەڵێن دەدات واز بهێنێت.

جاری دووەم دیسان بەڵێنی پێدەدات. کەچی هەر واز ناهێنێت. مەلای ڕەش ئەوسا پێیدەڵێت: پاش سێ جار پێگوتن:

- ئارەق خواردنەوە ئەو کەسایەتییەی ئەمڕۆ هەتە، ناهێڵێت.

دووەم: لەماڵی دونیاش پەرپووتت دەکات.

ئیتر مەلای ڕەش لەمەخموور باردەکاتو دەچێتە (دێمەکار)ی ئاوایی خوالێخۆشبوو (شێخ موحەمەد پاشا) لەوێش دەیەوێت بچێتە گوندی (عاللا)ی خوالێخۆشبوو (عەزیز پاشا)ی برای ناوبراو. بەخۆ..و فەقێوە بەگوندی (چەغەمیرە) دادەچن.

خوالێخۆشبوو: (ئاغاژنە فاتم)ی خێزانی (کانەبی ئاغا)ی دێیەکە بە خەڵکەکە دەڵێت: (با ئەو مەلا باشەی لە قیس خۆمان نەدەین).

جوتیارەکـانیش دەڵـێن: (ئـەو مەلایـە بـە خـەڵکی دەوڵەمەنـدی دێمـەکار بـەخێو نەکراوە بە ئێمە چۆن بەخێو دەکرێت).

ئەویش دەڵێت: (بەخێو دەکرێتو زیاتریش).

ئەوسا ئەو خوالێخۆشبووانە (حاجی جوکلو فەتاح ئاغا)ی برای ئاوبراو میوان دەبن، ئاغاژن ڕوویان تێدەکاتو دەڵێت:

- دەمەوێت ئەنگۆ هیمەتێك بکەن.

هەرسێکیان بەڵێن دەدەن: ساڵانە هەریەکەیان چوار عەڵبە گەنمی بدەنێ. (عەڵبە= ١٦ تەنەکە). دوازدە عەڵبە گەنم لەسەرەتای سییەکانی سەدەی ڕابردوودا ماڵێکی گەورەو خێزاندار گوزەرانی پێدەکرد.

بەم چەشنە مەلای ڕەش دەگێڕنەوە. هەرکە ماڵی دێت لەڕێگادا سوار سوارانیێو تەقەی خۆشی لە پێش دەکەن.

لەساڵی (١٩٢٥)دا هەتا ساڵی (١٩٣٣) لە مەخموور دێمەکار بەسەر دەبات.

مەلای ڕەش جارێك سەردانی مەخموور دەکات، میوانی موشیر دەبێت، شیوەکەی تەنیا ساواری ڕووت بوو. پێیدەڵێت:

- شیوەکەمان کووە؟.

- ئەگەر.. ڕۆنی هەبووایەو گۆشتو ترشی لەپاڵ بووایە بێ قسوور دەبوو.

موشیر هەست لەخۆی دەبڕێت.

- هەتا ئارەقت نەدەخواردەوە ماڵی دنیات زۆر بوو.. و (٤٠) چل لیرەت دامن بۆ ماڵ پێکوەنان. کەچی لەوەتی ئارەق دەخۆیتەوە توانای ماڵیت لەساواری ڕووت زیاتر نییە.

بە ئاخەوە دان بە هەڵەی خۆی دادەنێتو دەڵێت:

- بەقسەی جەنابتم نەکرد.. دۆڕاندم.



تێبینی:

بـاوکم ئـەو قسانەی هـەرگیز نـەکردووە، بگـرە لـە خـەڵکی شارۆچـکەی مـەخموور بیستراوە- نووسەر.

## مەلای ڕەش لەنیو دڵی خەڵکی دێیەکەدا

دڵسۆزیو بەردەوامی مەلای ڕەش لەسەر تەدریسو نەچوونی بۆ تازییەی دەرەوەو مەگەر بەدەگمەن، سەردانو گەشتوگوزار هەر هیچ. لەبەیانی دوای نان خواردن، چۆکی لەسەر حەسیری ڕەقی مزگەوتەوە، بەبێ پانکە لەهاویندا و ئاگر لەوەرزی ساردیدا دەداو دەرسی تا نوێژی نیوەڕۆ دەگوتەوە. بە پەلە نوێژی دەکردو نانی دەخوارد تا نوێژی عەسر. پاش نوێژکردن هەتا نوێژی مەغریب، بەبێ پارەو منەتەوە.

ئەمە وای کرد خەڵکی ناوچەکە، نەخەسەلە خەڵکی دێیەکەی جگە لە باوەڕیان بە مەلا باشیەوە، بە پیاوێکی پیرۆزی لەقەڵەم بدەنو بەوپەڕی شەوقو لەخۆبردنەوە خزمەتیان دەکرد.

بۆ بڕوای دڵی دوو دڵان لەم ڕووەوە: پاش پەنجاو دوو ساڵ تێپەڕ بوونی لەسەر وەفاتی پیاوێکی گوندی چەغەمیرەم دیت ئاوزەی من بوو، بە ژنەکەی گوت:

– دەزانی ئەوە کوڕی مەلای ڕەشە!.

ژنەکەی دوای بارکردنمان لەدایك بووبوو یەکسەر پڕیدا شانمو ماچی کرد–نووسەر.



## گوزەران

خوالێخۆشبوو (حاجی جوکل ئاغا)ی گوندی (قۆڕیتان) هۆیداوە. جگە لە دەغڵەکە ساڵانە یەك عەڵبە (چەلتوك)ی دەدا مەلای ڕەشو (فەتاح)ی براشی نیو عەڵبە. بە هەردووکیان عەڵبە برنجێکی زیاتر لێدەدەرچوو.

بۆ کوتانی چەلتووك ماڵی مەلای ڕەش یەکەم ماڵبووە، نەك لەئاوایی، لەناوچەی کەندێناوەدا (گرگر)ی[1] تایبەتی خۆیان هەبوو.

---

1- گرگر: دەستاڕی چەلتوك لێکردن.

خێزانــی مــەلاو کــچی و بــەهاوکاری ئافرەتــانی دراوســێ ســپیان دەکــردو بــە (جۆنی)یش لەحەوشەی خۆیان هەبوو دەکوتا.

لەسەرەتای چلەکانی سەدەی رابردوودا عەلبە برنجێك لەسەرتاپای ئەك ناوچەکە، بگرە لەسەرتاسەری دەشتی هەولێر، مەگەر لە هێندە مالا ئاغان دەنا پەیدا نەدەبوو.

ماڵی مەلا جگە لەمشە خواردنیان یارمەتی زۆر ماڵە هەژارو بێ ئەنوایان دەدا. نەخاسمە نەخۆش بووایە. باشترین خواردن، بۆ نەخۆش ئەوسا (شۆربا برنج) بوو.

لەساڵی (١٩٤٤)دا نەخۆشی گرانەتا لەناوچەکە پەیدا بوو. خەڵکێکی زۆری کوشت. لەئاوایی چەغەمیرە پێنج شەش کەس پێچوون. یەك لە ئەوانە کچێکی جاحێڵی تەونکەری مەلای ڕەش. ئەوسا کەم ئافرەت تەونی دەزانی. عەزیزی کوڕیشی گوێی چەپەی پێ گران بوو.

کیژێکیشی لەبەر ئەوە لەکاتی نەخۆشیدا شۆربای برنجی زۆر درابووێ، برنجی لەبەرچاو کەوت و هەتا مردن نەچووە سەر زاری.

وێڕای برنج زۆریش هەرکە وەرزی بەهار دادەهات مەڕدارەکانی ئاوایی لە هەر لاوە بەرخە کۆرپەی کوشتنەوەیان بۆ دەنارد. هەفتەی یەکیان دەکوشتەوە.

سالانەش نزیکەی (٢٠) بیست بردیلە= (شەکەمەڕ)ی زەکاتیان دەدایە. بۆیە ئەو گوزەران خۆشەی مەلای ڕەش هەیبوو باوەڕ ناکرێت هیچ ماڵە مەلاو ئاغایەکی ئەك دەشتی هەولێر، بگرە لەباشووری کوردستان ئەو تەرزە گوزەران و ژیانە خۆشەی بووبێت. ئەمەش بۆ پیاو باشی و بەدینی و بەخشندەیی خەڵکی دەڤەرەکە دەگەڕێتەوە.



# ئاغاژنە فاتم

خزمەتی خوالێخۆشبوو ئاغاژنە فاتم دەرحەق بنەماڵەی مەلای ڕەش هەرگیزاو هەرگیز بە حیساب نایەت و بەهیچ شتێك پڕ نابێتەوە.

کە بیزانیبووایە مـاڵی مـەلا نوقسانییەکیان هەیـە دەلحـاز بـەبیٚ پێگـوتنو داوا جێبەجێی دەکردو هەر جارێش دەیگوت: (مامۆستا من هەردەم خزمەتکاری جەنابتم. هەر شتێکتان پێویست بوو من وەك تای تـەورداس ڕاوەستاوم). هـەتا لەژیانـدا مـابوو مـاڵی ئاغا کـەمو زۆر درێغیـان لەخزمـەتی مـاڵی مـەلادا نـەکردووە. هەرکـە ئـەو نـەما خزمەتەکە بەرە بەرە کز دەبوو.

(قـەت قـەت لـەتوانای قەڵەمەکـەم دانییـە ئـەو چاکەو خزمەتـەی ئـەو کەلـە ئافرەتـە مەزنە وەك خۆی بخاتـە سـەر کاغـەزەوە. بۆیـە بەپێویـستی سـەر شـانی خۆمیـدا دەنـێم ناوی بەڕێزی بەوپەڕی شانازییەوە بخەمە سەر کاغەزو چیتریشم لەم ڕووەوە لەدەست نایەت)- نووسەر.



# ژن هێنـانی مامۆستا مەلا ڕەشید

خوالێخۆشبوو: مامۆستا مەلا (ڕەشید)ی موکوریـانی سکرتێرو.. وەزیـری دەستە ڕاستی مەلای ڕەش، لە گوندێك دەبێتە مەلا. دەیەوێت ژن بهێنێت. دەچێتە لای مـەلای ڕەشو داوای پارەی لێدەکات.

مــەلای ڕەش هیــچی نابێــتو نەشیدەویــست نائومێــد ڕەوانــەی بکاتــەوە. لــەو ڕۆژانەشدا کابرایەکی ئاوایی کچی خۆی بەشیربایی دابوو، مەلای ڕەش پێیدەڵێت:

- دەتەوێت ئەو پارەیەت بۆ حەڵاڵ بکەم؟.

پیاوەکە بە کەیف خۆشیەوە دەڵێت:

- وەللا مەمنوونیشت دەبم.

- ئەو پارەیـەی لاتـە بدە مـەلا ڕەشید ژن پـێ بهێنێـت مـن هەرکە بەردیلم فرۆشت پارەی حەڵاڵت دەدەمەوە.

کابرای تایەن ڕازی دەبێتو پارەکەی دەداتە مامۆستا مەلا ڕەشید.



# پرس پێکردنی دووەم

لەساڵی هاتنی (مستەر لاین) ئەندازیارێکی بەریتانی بوو، بۆ دابەش کردنی زەوی‌و زاری ناوچەکە، چەند پیاوی ڕیش سپی‌و جوامێری ئاوایی (دێمەکار)و (چەغەمیرە) دەچنە لای مەلای ڕەش‌و دەڵێن:

– ڕات کووە ئێمە دەمانەوێت: زەوی خۆمان نەدەینە ئاغا؟.

مەلای ڕەش ڕوو لە دێمەکارییەکان دەکات‌و دەڵێت:

– بۆ ئێوە سەردەگرێت. ئەگەر ئێسك شکان کەوتە نێوان ئێوەو ئاغاکەتان، لەبەر ئەوەی خزمی یەکترن، ناچار دەبن پشتی یەکتر بگرن، بەڵام چەغەمیرەیی لەبەر ئەوەی خزمی یەکتر نینە پەرتەوازە دەکەن.

ئیتر دێمەکاری بەقسەیان کردو زەوییەکانیان لەسەر خۆیان تاپۆ کردو چەغەمیرەییش زەوییەکانیان پێشکەش بە ئاغا کرد.



# مەسەلەیەکی شەرعی لەسەرەتای پەنجاکان

کابرایەك لە هەمان ئاوایی سوێند بە تەڵاق دەخوات (بۆ ئاغاکەی ئیش نەکات).

(بەداخەوە کارەکە لەیاد نەماوە– نووسەر).

ئەوسا خوالێخۆشبوو شێخ کاکە لەدێیەکە دەبێت‌و پێیدەڵێت:

– بچۆ سەر کارەکەت تەڵاقت ناکەوێت.

کابراش بە قسەی دەکات دەگەڕێتەوە سەر کارەکەی. ڕۆژێك مەلایەك وەبەر گوێی سوێندخۆرە هەڵدەدات‌و دەڵێت:

– لاموایە تەڵاقەکەت دەکەوێت. بۆ ناچیتە لای مەلای ڕەش.

کابرا بەگوێی دەکات‌و دەچێتە ئاوایی چەغەمیرە. خوالێخۆشبوو (مەلا حوسێنی شەعەل) موستەعیدی مەلای ڕەش دەبێت‌و لەشەرع ئاگادار بوو.. و دەڵێت:

– مامۆستا ڕێم دەدەیت ئەمن شەرعەکەی بکەم.

هەرکە مەلای ڕەش ڕێپێداو دەڵێت:

- لەبەر ئەوە ئیمانی بە شێخ کاکە بووە تەڵاقەکە تا ئەوساتە ناکەوتووە، بەڵام لەمەودوا بچێتە سەر کارەکەی دەکەوێت.

مەلای ڕەش ئەوسا دەڵێت: (شەعەل بردی) ئەمە خووی بوو ئەگەر یەکێك مەسەلەیەکی لە پێش بزانی بووایە.



## ئەو مەلایانەی لایان خوێندووە

ئەمانە ناوی هێندێکی کەمە لەو مەلایانەی لای مەلای ڕەشیان خوێندووە:

(مەلا ڕەشیدی موکریان. مەلا عەلی عەودالان. مەلا عەبدوڵلای چرۆستانی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس. مەلا ئەبووبەکری دووگردکان. مەلا موحەمەدئەمینی سوێری. مەلا مستەفای بێلنگە. مەلا عەبدوڵلای سەقز. مەلا عومەر مەولوود دیبەگەیی. مەلا عومەری کەور. مەلا موحەمەدی مەخموور. مەلا فەتاحی مەخموور. مەلا عەزیزی حوسێنە گەورە. مەلا ئەحمەدی گورزەیی. مەلا ئەحمەدی قەرەبەك. مەلا تاهیری کەنداڵە قەڵ. مەلا سەلیمی دیبەگە. مەلا موحەمەدئەمین بایز. مەلا عومەری مەرزان. مەلا عەزیزی قادر بلە. مەلا ئەبووبەکری شەرکان. مەلا عومەری وەسمان. مەلا سادق کەسنەزان. مەلا قادری دێمەکار. مەلا زاهیری دێمەکار. مەلا قادری دارەخورما. مەلا عەبدوڵلای جانە. مەلا عوسمانی بیرەعارەبان. مەلا عوسمانی جەعفەر. مەلا ساڵحی جەعفەر. مەلا سابیری مورتکە. مەلا سابیری بیرەعارەبان. ناوی دەیانیش لەیاد کراوە.



# باسی هێندێك لەو مەلایانەی لایان خوێندووە

## مەلا زایەر

هەرکە مەلای ڕەش لەگوندی دێمەکار باردەکات خوالێخۆشبوو مەلا (زایەر)ی دێمەکار، لەعەشیرەتی بندیانە موستەعید دەبێت. دۆستایەتی زۆر بەهێزی لەگەڵی ماڵی مەلای ڕەش هەبووە. ماوەی دوو ساڵ زیاتر هەموو ڕۆژی بەیانیان زوو لەدێمەکارڕا کە (٤٠) چل دەقیقە بەپێیان دوورە، بەسەرماو گەرماوە چووەتە ماڵی مەلای تایەن. مەلا ژن هێشتا لە نان کردن نەدەبووەوە ئەو حازر دەبوو. تا مەلاژن دەستی بەردەبوو ئەو چایەی لێدەناو نان و چایەی خۆی دەخواردو دەرسی لەماڵەوە دەخوێندو مەلای ڕەش بۆ حوجرە دەچوو..و ئەویش دەگەڕاوە. هەتا ئەمڕۆی حازریش ئەو پەیوەندییەوە لەنێوان منداڵەکانی هەردوولا هەر ماوە. بەتایبەت لەگەڵ ڕێزدار (خالید)ی کوڕە گەورەکەی ئامەشۆی گەرم و گوڕ لەنێوانیاندا هەیە.



## مەلایەکی باکووری کوردستان

مەلایەکی ڕیش سپی لەباکووری کوردستانی داگیرکراودا بۆ خوێندن کتێبی (تەهزیب)ی (عیلمی کەلام)ە لەسەرەتای سییەکانی سەدەی رابردوو دەچێتە لای مەلای ڕەش لەدێی دێمەکار. دەڵێت من مەلامەو حوجرەی تایبەتی خۆم هەیەو دەرس دەڵێمەوە فەقێ هەرکە دەگەینە کتێبی تەهزیب، من ئەم خوێندووە بەجێم دێلن. چوومە خزمەت مەلا ساڵح و مەلا عەبدوڵلا لەشاری هەولێر، چەند دەرسێکم لەخزمەتیان خوێندو.. عەقڵم نەیگرتوو..و هاتوومە خزمەت جەنابت.

مەلای ڕەش یەکسەر دەزانێت لەبەرچی عەقڵی دەرسی ئەو دوو مەلایەی نەگرتووە. بۆیە پێیدەڵێت:

- تۆ هاتوویت موناقەشە بکەیت، یان تەهزیب فێر ببێت؟.
- بەس بۆ ئەوە هاتوومە تەهزیب فێر بم.

- کەواتە تاکو لای من دەخوێنێت تەماشای حاشیەی قەرەداخی مەکە.

- باشە سەرچاو.

پاش تەواو کردنی کتێبەکە بە مەلای ڕەش دەڵێت:

- وەڵڵا ئەوانیش مەلان بەڵام تۆ زۆر زانتری.

- چۆن؟.

- ئەوان هەرکە شەرحیان دەکرد لەگەڵ قەرەداخیەکەی ژێری نەدەگونجاو منیش لام وابوو نایزانن و نەمدەسەلماند. بە ئامۆژگارییەکەی جەنابت بۆم دەرکەوت حاشیەکە بە هەلە راڤەی کردووەو تەمزیبێکی باشت فێر کردم.



## مەلا عەبدوڵڵای سەقز

خوالێخۆشبوو: مامۆستا مەلا (عەبدوڵڵای سەقز) ڕوو لە شاری هەولێر دەکات و دەچێتە خزمەتی ئەفەندی و پێیدەڵێن:- (ئەو مەلایە لە سەقزەوە هاتووەتە خزمەتت).

ئەویش دەفەرمووێت: (من ئامادەم دەرسی پێ بڵێم).

- قوربان: هاتوومەتە خزمەتت تاکو کاغەزێکم بدەیتێ بۆ مەلای ڕەش قەبوولم بکات.

- چ لە کنە من بخوێنیت، چ لە کن ئەو هەریەکە.

کاغەزێکی بۆ مەلای ڕەش دەنووسێت: (ئەوە خزمی خۆتەو بەبێ کاغەزی ئێمەش هەر دەرسی پێدەڵێیت، بەڵام لەسەر داوای ئەو نووسیومە).

ئەوسا ئەو خوالێخۆشبووانە لای مەلا ڕەش موستەعید دەبن (مەلا عومەر مەولوود دیبەگەیی و مەلا خەلیلی دووسەرەو مەلا عوسمانی جەعفەری و مەلا عوسمانی بیرەعارەبان).

هەرکە ئیجازە وەردەگرێت مەلای ڕەش پێیدەڵێت: (مەچۆوەو لێرە ببە مەلا و من کچی خۆمت دەدەمێ).

ئەویش دەڵێت: (من زۆر مەمنوونم بە کچی جەنابت، بەڵام پێم خۆشە بچمەوە ناو خزمو ئەقریبا).

- پەشیمان دەبیتەوە.
- بۆ..؟.
- ئەلئەقربو کەلعەقرەبی.

ئەمەش لەسەرەتای چلەکانی سەدەی رابردوو دەبێت.



## مەلا قادری دێمەکاری

خوالێخۆشبوو مامۆستا (مەلا قادری بندیان) لەگوندەکەی خۆیان (دێمەکار) لەحوجرەی مەلای ڕەش دەست بەخوێندن دەکات. هەرکە دەگاتە پلەی موستەعیداتی دەچێتە لای مەلای ناوبراو لەدێی چەغەمیرە.

مەلای ڕەش لەبەر دەرس گوتنەوە، نەسەفەری دەکردو نەدەچووە تازییان. کەچی ئەگەر فەقێیەك خوێندنی تەواو بکردبووایە دێیەکی بۆ دەدیتەوەو دەکردە مەلا.

هەرکە مامۆستا مەلا قادر خوێندن تەواو دەکات مەلای ڕەش لەسەر حسێبی خۆی پاسێك دەگرێت لە ئاوایی (پونگینە)ی هادی ئاغا بە مەلای دادەمەزرێنێت.

لەبەردەمی خەڵکی گوندەکە بە باڵای هەڵدەدات بەڵام لەیاد نەماوە چیگوتووە. تەنیا ئەمە نەبێت، کە ئەوسا ببووە بنێشتە شینکەی سەرزاران:

(مەلا قادری دێمەکاری عەلەیهی روحمەتولباری).



## مەلا ئەبووبەکری شەڕکان

خوالێخۆشبوو: مامۆستا مەلا (ئەبووبەکری شەڕکان) لەدێی (دێمەکار) لای مەلای ڕەش دەخوێنێت. دەستی تووشی جۆرە خرووشتێك دێت. موستەعیدەکانی هاوڕێی بە مەلای ڕەش دەڵێن (دەبێ دەری بکەیت).

ئەویش پێیدەڵێت: (مەلا ئەبووبەکر براکانت قێزت لێدەکەنەوەو دەڵێن: دەبێ بڕۆیت).

بەمە ناچار دەبێت بڕوات.

دوای ڕاپەڕین مامۆستای ناوبراو سەردانی خێزانی مەلای ڕەش کرد لەشاری هەولێر. ڕووی لە مەلاژن کردو گوتی:

– داك مەلاژن: مەلا ئەبووبەکرو مەلا حەمەدەمین لەترسی مردن منیان بەدەرکردن دا، کەچی مەلا ئەبووبەکر بە سەرەتانی خوێن چوو..و مەلا حەمەدەمینیش بەسەرەتانی قوڕگ، منیش هەروا ملم ئەستوور دەبێت.

پاشدان گوتی:

– لەناوچەی خۆمان خۆم لەناو مەلاکان هەڵدەکێشاو دەمگوت: (من جەمعولجەمیع)م لەخزمەت مەلای ڕەش خوێندووەو ئێوەش لای جەنابی مەلای کۆیی، بابزانین کامەمان باشتری دەزانی.

گوتی: من باشترم دەزانی.



## مەلا فەتاح

خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا فەتاحی مەخموور دایکی لەگەڵ خێزانی مەلای ڕەش ئامۆزا بوون. پەیوەندیان زۆر بەهێز بوو. ناوبراو لای مەلای ڕەشی دەخوێند.

منداڵەکانی مەلای ڕەش کوڕو کچ لە خۆشەویستیان پێیان دەگوت: (کاکە فەتاح).

لەلایەن خێزانی مەلای ڕەشەوە زۆری ڕێز دەگیرا. ئەویش مەلاژنی بەگەورەی خۆیدا دەنا.

هەرکە خوێندن تەواو دەکات مەلای ڕەش لەگوندی (پەرکانە)ی جەمیل ئاغای کردە مەلا.

مەلاژن لەگەڵ عەزیزی کوڕی ئەوسا شەش حەوت ساڵان بوو ژنی لەگوندی (حوشترالووك)ی قەراج، بەمنداڵیەوە مارەبڕی بوو گواستەوە.

ئەو خۆشەویستییە بەردەوام بوو. تا عەزیز بەمندالّی بۆ خوێندن چووە حوجرەی ئەو. کەچی ڕازی نەبوو..و گوتی (کوو دەبیّ عەزیزی پلکم بەمیە لە حوجرە بێت) بردییەوە مالّەوە.

خێزانەکەی خوالێخۆشبوو دایکی جەباری بەفەخرو شانازییەوە خزمەتی عەزیزی دەکرد. هەر جاریّ پێیدەگوت: (هەر ئیشێکت بوو بە من بلّیّ تاکو لۆت جێبەجیّ بکەم).

ئەو پەیوەندییە ڕۆژ بەڕۆژ پتەوتر دەبوو. هەرکە ناوبراو بووە مەلای مەخموور مەلاژن ناوە ناوە سەردانی دەکردن و هەر جاریّ بە بیست شەوّ مانگ ئیزنیان نەدەدا.



## مەلا سەلیم

خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا (سەلیم)ی دیبەگە لەحوجرەی مەلای ڕەشی دەخوێند.

پێش ئەوەی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرێت، خوالێخۆشبوو (حەسەن ئاغا)ی دیبەگەی بەری خۆرئاوا پیاوێکی بەدین و ڕۆشنبیرو ئەودالّی زاناو مەلایان بوو، جەواب بۆ مەلای ڕەش دەنێریت هەر موستەعیدێك ئیجازەی وەرگرت بینێرە لای من دەیکەمە، مەلای گەڕەکی خۆم.

زۆری نەبرد مەلا سەلیم ئیجازەی وەرگرت و مەلای ڕەش بە مەلایەتی لەگەڕەکی ئاغای ناوبراوی دامەزراند.

خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا (ئیسماعیل)ی دیبەگە زۆر لەبەر دلّ دەبێت. چونکە تا ئەو ڕۆژە مەلایەتی ئەو گەڕەکیشی دەکرد. مەلای ڕەشیش بیّ ئاگابوو.

هەرکە مەلای ڕەش وەفات دەکات نایەلّێت مەلا فەتاحی برای، کە پێشتر باس کرا تازییەکە بکات. پاش ماوەیەك. دلّی بەروەست نادات، بەدزی مەلا ئیسماعیلی برای دیدەنی مالّی مەلای ڕەش دەکات و تەوازووش دەخوازتەوە.

ماموّستا مەلا سەلیم لەئاست مەلای ڕەشی ماموّستای زوّر بەوەفابوو، دوو جار بوّ عیلاجی چاوی لەگەڵی چوو بوّ شاری موسڵ.

هەرکە زانی مەلای ڕەش گوزەرانی لەبار نییە، لەگەڵ خوالیّخوّشبوو حەسەن ئاغای گوّرین مەلای ڕەش لەدیّی مورتکەی عەلی ئاغا دادەمەزریّنن.



## ئەو مەلایانەی ئیجازەیان لا وەرگرتووە

مەلای ڕەش ئیجازەی زوّر مەلایانی داوە، بەڵام کەمیّکیان لەیاد ماون:

(مەلا سەید غەفووری مەلاکاغا. مەلا سەلیمی دیبەگە. مەلا کەریمی ناسری. مەلا ئەحمەدی گوّمەگرو. مەلا سولیّمانی شەریفە قیت. مەلا عومەری حاجی مەحموود. مەلا عومەری چوّمەزەردەرەو مەلا عەبدوڵڵای سەقزو چەندی تر کە لەیاد نەماوە.

## ئیجازەدان

ئیجازەی مەلایەتی لەبریتی (شەهادەی تەخەروج)ی ئەمڕوّ بوو.

لەشیّوەی تەریقەتی شیّخان لەپیّغەمبەرەوە(د.خ) پشت بە پشت هاتووەتە خوارەوە، تادەگاتە ئەو مەلایەی ئیجازەکەی دەدات.

مەلا پلەی زانیاری مەلایەتی هەرچەند بەرز بیّت و تەدریس بکات، ناتوانیّت ئیجازە بدات، تا ئیجازەی لەمەلایەکی تری موجاز وەرنەگریّت.

هەر فەقیّیەك ئیجازەی درایێ، واتە ماموّستاکەی کردی بە موفتی و دەتوانیّت لەنیّو موسڵمانان فتوانات.

هەرکە ئیجازەکە دەدرا چەند ڕوّژ پیّشتر وەك زەماوەند لەدوای فەقیّ و مەلای گوندەکانی دەوروبەر دەگیّردراوە. موستەعیدیّك یان چوار پیّنج موستەعید دەیان توانی بەیەکەوە ئیجازە وەرگرن.



# ئیجازەیەك

ئیجازەیەك لەڕێكەوتی (١٩٤٩/١١/٣)دا لەگوندی چەغەمیرە درا. موستەعیدەكە خوالێخۆشبوو (حاجی مەلا عومەری شێروانی) بوو. لەدوای فەقێ‌و مەلای ئەو گوندانە گێردراوە: (لهێبان، قەپڵان، سەرگەڕان، پەلكانە، قوچ، سەربەشاخ، جاستان، كەنداڵە قەڵ، لاوەر، كەنداڵ، كۆزەپانكە، عەوێنە، دووسەرە، عاللا، سووریژە، شێخ شەوان‌و تەلەلخێم).

مەلای ئەو گوندانەی فەقێیان نەبوو..و چەند كەسانی دیاری ناوچەكە. دوو شەوو دوو ڕۆژ، یان دوو ڕۆژو شەوێك مانەوە. جگە لە خەرجی‌و خواردنی میوانەكان جوبەو مەندیل‌و (عەمامە)ی موستەعیدە موجازەكە لەسەر خوالێخۆشبوو (كانەبی ئاغا) بوو. تا دەستی كورت بوو.. تواناى مەسرەفی ئیجازە دانی نەبوو، ئەو خوالێخۆشبووانە (حاجی جوكل‌و فەتاح ئاغا)ی برای یارمەتیان دەدا. ئەمەش هێمای پیاو باشی‌و بەدینیان بوو. ئەگەرنا چ مەجبوور نەبوون مەسرەف بكەن.

ڕۆژی (١٩٤٩/١/٢) دانی ئێوارە میوانەكان هاتن.

ڕەوشت وابوو هەركە مەلاو فەقێ میوانەكان دەگەیشتنە بەرئاوایی دەستیان بە بەستەو مقام گوتن‌و چەپڵە لێدان دەكرد. فەقێ خانە خوێیەكانیش بە بەستەو چەپڵەوە پێشوازیان دەكردن. ئێوارەی یەكەم شلەساوار بە گۆشت بوو. بەیانی نان‌و ماست‌و هێلكە، نیوەڕۆش پڵاو برنج‌و گۆشت.

سەرپەرشتی خواردنەكەو كابانی ڕاستەقینە خوالێخۆشبوو ئاغاژنە (فاتم) بوو. بە ئەنقەست لەحەد زیاتری چێشت دروست دەكرد.

من بە خۆم لەدیار بووم پێیان گوت: (یەكجار زۆرەو خەسار دەبێت). ئەویش گوتی:

– با زۆر بێت لەلایەك نوقسانیمان نایەتەوە سەر، لەلایەكی دیكەوە ئەوەی ماوە بەسەر دەورو جیرانان دابەش دەكەین.

هیچ جۆر ئەرکێك لەسەر شانی جوتیاران نەبوو. تەنیا نوین و قاپ و قاچاخ لەئاوایی خڕدەکرانەوە، یاخو ئەگەر دنیا سارد بووایە، لەدیوەخان و حوجرەکان جێگا نەبووایە، چەند کەسانیك بۆ نووستن بەسەر ئاوایی دابەش دەکران.



ڕۆژی یەکەم دوای نوێژی عەسر یەکیان کردە پاشاو کڵاوێکی درێژی ڕەنگاوڕەنگیان لەسەرناو لای سەرەوەی وێنەی دەستێکی لێکرابوو. لێی نووسرابوو: (ید الله فوق أيديهم).

دوو کەس بوونە وەزیری دەست ڕاست و چەپ. یەکێکیش بەردەستی دەکردن و سەرپەرشتی ئاهەنگەکەی دەکرد. واتە عەریف (حەفل) بوو.

ئەو کەسەی بووە (پاشا) خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا (خدر)ی شەمامەرو.. وەزیرەکانیش ئەو خوالێخۆشبووانە بوون: مامۆستا مەلا (موحومەدی شێروانی و مامۆستا مەلا شەریفی عاللا) بوو.

سەرپەرشتکەرەکە خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا (موحەمەدی عەلیاوە) بوو.

ئەوانەی لەئاهەنگەکەدا بوون، بەلاییدەو خۆیی و خەڵکی ئاوایی بوونە. سێ چوار ڕێز. ڕیزی پێشەوە پاشاو وەزیرەکان بوون. لەپشت پاشادوو فەقێ خەنجەری ڕووتیان بەدەستەوە گرتبوو. فەقێیەکیش بۆڕییەکی سەماوەری لەجیاتی (مەدفەعی) بەدەستەوە بوو..و لەدوای خەنجەر لەدەستەکانەوە دەڕۆیشت.

چەند فەقێیەکی بەوەج کورتەکیان لەبریتی بەنتلۆن لەبەر کردبوو..و کڵاویان بێ جەمەدانی بەوەرگەڕایی و لاتیوی لەسەرنا بوو، هەریەکەیان پشتێنێکی بەتوندی بادابووەوە. تەرزی قامچیان لێکردبوو. ئەوانە (زەفتیە- شورتە) بوون و بەرپرسی ڕێك و پێکی ڕیزەکان و نەیاندەهێشت بە هیچ جۆرێك کەس بەملاو بەولادا بێت و بچێت. یان بە پێش ڕیزی پاشا بکەوێت. هەر کەسێك پەیڕەوی پێچەوانە بووایە بە قامچیان دەیان بردەوە ڕیزەکان. قامچیشیان بە هەر کەسێك بکەوتبووایە جێگاکەی شووی دەبەستا. بۆیە کەس تاسای نەدەکرد ڕیز تێك بدات.

دوو فـەقێی تـر هەریەکـەیان لـەجیاتی (ڕەشـاش) بـۆڕی سـەماوەریان لەدەسـت گرتبـوو..و ناویـان پـڕ بـەردە وردە کردبـوو. هەرکەسـێك، یـان منـداڵێك بـە پـێش بکەوتبووایـە، دەکەوتنـە دوای و بەبۆڕییـەکان بـەردەکانیان تێـدەگرتن وەك ڕەش خڕەخڕیان لێوە دەهێنا.

دکتۆرێـك، فەراشـێکی لەگەڵـدا بـوو..و سـینیەك لەسەرسـەری فەراشـەکە بـوو..و کەلوپەل و دەرمانی تێدابوو. کە بریتی بوو لە (ئاردو هەویرو ڕەژوو= خەڵوزو قشپل.. مەسینەیەکی پڕ ئاوو بۆڕییەکی سەماوەر).

ڕیزی پێشەوە چەپڵەیان لێدەداو بەستەیان دەگوت. لەڕیزەکانی تر هەر چەپڵە لێدان بوو. بەم جۆرە فیتە بەدەورەیەکی هەر چوار لای ئاوایی یان کرد. تا هاتنەوە ساکە گۆڕێکی نزیك حوجرە. لەو کاتەدا بەفەرمانی زەفتیەکان لێکرا بە خڕی و یەك ڕیز دانیشتن. لەبەر قامچی زەفتیەکان کەس نەدەوێرا لەجێگەی خۆی هەستێتەوەو ڕیزەکە تێك بدات.

سێ کورسیان لەپاڵ یەکدانا. کورسی ناوەڕاست بۆ پاشاو دوو کورسیەکەی دی وەزیرەکان لەسەری دانیشتن.

دوو خەنجەر لەدەستەکان لەگەڵ مەدفەعچییەکە لەپشتەوەی پاشا ڕاوەستان و دوو ڕەشاش لەدەستەکان لەملاو لەولا.

دکتۆریش کەلوپەلی خۆی لەنزیك ئەوان داناو لەسەر کورسیەك دانیشت.

زەفتیەکان هەر چاوێکیان کردبووە چوار چاو نەبادا یەکێك بێتە ناوڕاستی یاریەکە، یان هەستێتەوە.

بەفەرمانی پاشا. جگەرە پێشکەش بە پیاوماقووڵ و مەلا گەورەکان کرا. بریتی بوو لە چیلکە دارێکی باریك کەرتە قەرسەقولی پێوە کرابوو. دەبووایە قومیش لێ بدەن. تا یەکێك لەکاتی قوم لێداندا گوتی:

- (پەح.. توتنێکی چەند خۆشە!.. بۆنداریشە).

عەریف حەفلەکە لەناوەڕاستی عەشاماتەکە ڕاوەستاو پڕ بەزار هاواری کردو گوتی:

- (مـژدە، مـژدە ئـەی خەڵکینـە، مزگێنیـەکی زۆر خـۆش، لـەوەتی دنیـا دنیایـە حکومەتی وەك ئەو حکومەتەی ئێمە دادپەروەرو عادیل نەهاتووەتە سەر ڕووی زەوی. بـەڵام بەداخـەوە (قـەوان)ی یـەکجار زۆرەو (گوللـە)شـی نییـە. بۆیـە پێویستی زۆر بـە پارەیە. جا ئەو کەسانەی دەوڵەمەندو پارەدارن و دەیانەوێت حەقێك بکەن بە ناحەق، یان بەپێچەوانەوە با بێتە پێش و دەرگای حکومەت بۆ ئەم جۆرە کەسانە هەردەم لەسـەر پـشتەو ئێمـە زۆر بەشـانازییەوە پێـشوازیان دەکـەین و بـەزووترین کـات کاروباریان بۆ رادەپەڕێنین، بەڵام ئەو کەسانەی ڕەش و ڕووت و بێ پارەنەو زولمیان لێکراوە ڕەزایـان لای دەسەڵاتداران قـورس و گرانـەو پێویـست بـە هاتنیـان ناکـات و داواکانیان پشت دەخرێت.



# شکایەت

یەکێك چووە لای پاشاو شکایەتی لە کانەبی ئاغای گوندی کردو گوتی: (کانەبی ئاغا کەری منی فەساد کردووە).

زەفتیەکان چوون کەرەکە، بریتی بوو لەکابرایەك و لەگەڵ کانەبی ئاغا یان هێنا.

دختۆر لەهەوەڵەوە کابرای بیووە کەر لەسەر پشت ڕاکشاندو بەبۆڕی سەماوەر بردنە نێو لنگانی و فەحس کردو گوتی: (بەڵێ ڕاستە هەردوو شتەکەی کردووەتە یەك دەبێ تیمار بکرێت).

دختۆر دەمی خۆی پڕ ئاردو ئاو کردو سەری بۆڕییەکەی بەنێو دەلینگی شەڵواری بردە نزیك عەورەتی و ئەوەی نێودەمی پرژاندە نێو گەڵانی و چەند قلە قشپلی دایەو گوتی: (دەبێ ئەو حەبانە ڕۆژێ سێ جار بخۆیت).

کانەبی ئاغایان هێناو لەسەر گازەرەی پشتیان درێژ کرد.

خوێنەری هێژا سەیری ئەو دیمەنە بکە: (ئاغای گوندێکی سەت ماڵی و ناوداری سەرتاپای ناوچەکەو جەستە زۆر گەورە، لەناوەڕاستی عەشاماتی خەڵکەکەوە، لەسەر

تیلەقەی پشت ڕاکشاوەو فەقێیەکی لاییدەو نەناس لنگی بڵند کردووەتەوەو بۆڕی سەماوەری لەنێو گەلانی ناوە. ئەوجا لەجیاتی تێك بچێت و تووڕە ببێت شانازی پێوە دەکرد.

ئەو خزمەتی ئاغاواتی دزەیی، بەتایبەتی بنەماڵەی بایزو خوالێخۆشبوو (سلێمان ئاغا)ی دیبەگە، هی فەقێ و مەلایان کردووە باوەڕ ناکەم لەسەرتاپای کوردستانی گەورە ئەو خزمەتە کرابێت.

ئەو پەیوەندییە بەهێزو خۆشەویستەی نێوان ئاغاو کرمانج و مەلاو فەقێیان، بەسەرهەڵدانی شارستانیەت، سەرەتاکەی دەرکەوتنی تەرەکتەرو دەراسەبوو بۆ هەتا هەتایە تەفرو توونا بوو– نووسەر.

شەو پاش نوێژی عیشا دوو یاری کرا:

یەکەم: (ورچ و مەیموونانێ).

ئەمەش بەم چەشنە بووە: دوو فەقێ وەك گیاندار داوەرا بوونەوە یەکیان پاشەڵی ئەویتری گرتبوو..و جاجمێکیان بەسەردا دابوون گوایا ورچە. پەتێکیان لەملی ئەوەی پێشەوە کردبوو. یەك سەر پەتەکەی بە دەستێکەوەو بەدەستەکەی تری شولەدار.

یەکێکی تریان دەمو چاویان بە تەنی ڕەش ڕەش کردبوو گوایا: مەیموونەو پەتێکی لە مل و سەری ئەویش بەدەست یەکێکی ترەوە بوو.

ئەوەی ورچەکەی لەدەست بوو بەشولەدارەکە لەپشتی ورچەکەی دەداو مقامێکی: (بەداخەوە لەبیرم نەماوە.. نووسەر)لەگەڵ دەگوت: ورچ و مەیموونەکە بەنزمی مقامەکە هەڵدەپەڕین.

هەڵپەڕینی مەیموونەکە بۆ پێکەنین بوو، کەچی هەڵپەڕینی ورچەکە تەنیا بۆ ئەوەی بوو پێلەقەی لەو کەسانە دەدا لەڕیزی مەجلیسەکەوە چوار چەمکی دانیشتبوون. واتە جێگەیان زۆر گرتبوو. با پیاوی ناوداریش بووایە. بۆیە کەس نەدەوێرا لەسەر چۆك بترازێت، کە جێگەی زۆر نەدەگرت دانیشێت. دواجار لەکاتی کۆتاییدا مەیموونەکە خۆی هەڵدایە سەرپشتی ورچەکەو چوونە دەرەوە.



دووەم:- (ئاشەوانانیّ).

هەرکە ڕیزی خەڵکەکە ڕێکخراو بەڕێکی دانیشتن ئاشەوانانی دەستی پێکرد.

کابرای ئاشەوان (فەقێیەك بوو). بۆ ئەوەی ورگن دیاربێت بالیفێکی لەسەر زگی خۆی دانابوو. لەناوەندی خەڵکەکە لەسەر گازەرەی پشت لیّ نووست. کوڕێکی مێردمندالّ هەبوو لەدیار ئاشەکە (دوو سیّ تەنەکەیان) لەسەر یەك دانابوو، دانیشت. باوکیشی پرخ و خوڕی خەوی بوو.

یەکێك هاتە لای کوڕەکەو گوتی: (من باراشهێڕم و هاتوومە باراش لیّ بکەم).

کوڕە بەدار وەرگەڕا ورگی باوکی و هەر جاریّ لێیدەداو دەیگوت: (بابە، بابە)، تا بەخەبەری دەهێناو دەیگوت: (هەستە باراش هاتووە).

ئاشەوان ڕووی لەباراشهێڕ کردو گوتی: (باراشەکەت چییەو لەچیت بار کردووە؟).

باراشهێڕ گوتی: (بارەکەم نیسکەو ولاّخەکەم گیسکە).

ئاشەوان بەڕووگرژییەوە گوتی: (ئاشەکەم بەردەکانی کوڵن و بیرازیان دەوێت. ئەمڕۆ پێم ناکرێت).

باراشهێڕێکی تر هات و گوتی: (باراشەکەم مزاشەو ولاّخەکەم جاشە).

ئاشەوان ئەویشی بە چەشنی سەرەوەی بەڕێکرد.

یەکێکی تر هات و گوتی: (کەرم پێیەو باراشەکەم جۆیە).

ئاشەوان بەهەشتاوییەوە گوتی: (ماکەرە، یان نێرەکەرە؟).

- نێرەکەرە.

ئەویشی بە نائومێدی ڕەوان کردەوە.

دواجار یەکێك هات و گوتی: (بارەکەم گەنمەو کەرەکەشم ماکەرە).

یەکسەر قیت بووەوەو باراشەکەی لەگەڵ هێنا خوارەوەو کوڕەکەو باراشهێڕەکەی بە باراش لێکردن خەریك کردن. بەخۆشی چووە گژ ماکەرەکە، بریتی بوو لەپیاوێك.

هەرکە باراشهێڕەکە دێتە دەرەوەو دەیبینێت و دەڵێت (کوڕە ئەوە چ دەکەیت!؟).

ئاشەوان یەکسەر.. ڕووەو قیبلە، لەسەر چۆك دادەنیشێت و دەڵێت: (التحیات والمبارکات...).

ڕۆژی دوایی چێشتانێکی قایم خەڵکەکە لێکرا لەسەر سەکۆی دیوەخان دانیشتن. موستەعیدە موجازەکە: خوالێخۆشبوو: (مامۆستا مەلا عومەری شێروانی) بوو. پاش خۆشوشتن و سەرو ڕیش تاشین بۆ یەکەمجار جوبەی لەبەر کردو مەندیل و کڵاوێکی سپی لەسەر ناو لەناوەڕاستی خەڵکەکە، لەسەر رایەخێك، بەرامبەر بە مەلا موجیزەکە، مەلای ڕەش بوو، دانیشت.

یەکێکی دەنگ خۆش نەختێك قورئانی پیرۆز خوێند. پاش قورئانەکە مەلای ڕەش لەسەر چۆك ئیجازەنامەکەی بەدەنگێکی بەرزو ڕەوان، دوای ئیمزاکردنی خوێندەوە بەعەرەبی.

ئەمەش ئیجازە نامەکەیە بەزمانی عەرەبی. دوای مۆرکردنی لەلایەن سێ مەلای موجیز. کە ئەمانە بوون: (مامۆستا مەلا ئەبووبەکری دووگردکان و مامۆستا مەلا ئیسماعیلی دیبەگەو مامۆستا مەلا موحەمەد شێروانی). ئەمەش لەڕۆژی (١٩٤٩/١١/٣)دا بووە:

((... أما بعد فيقول خادم تراب أقدام العلماء والفضلاء أفقر العباد الى الله الغنيّ احمد بن عبدالرحيم الموسوم بالباني ان العلم لواء قدره موضوع لايوضع. وإن ممن اهتدى بنور الله الى الصعود في نماذج هذه المرتبة دون أقرانه ونجلّى عليه انجم السعود من رصد النظر الى هذه المنقبة دون اخوانه نائل هذه النميقة وحاصل هذه الوثيقة العالم العامل والفاضل الكامل قد بذل شطر أيام دُهره وصرف معظم ريعان عمره نحو اقتناء شوارد الرسوم العقلية واجتناب العلوم النقلية وطوى رداء شبابه لأحراز الفنون وجاب مفاوز الشدائد للوصول الى السر المكنون. ثم صاحبنا مدة من الأزمان وبرهة من الأوان. واشتغل فيها عندنا بقراءة كتب معتبرة. مطولة ومختصرة. حتى تحقق لدينا انه عرج معارج التحقيق واعتلى على سنام مدارج التدقيق. وقد التمس من الفقير المعترف بالذنوب والحقير المقترف للخطايا والعيوب ان يجيزه بتدريس العلوم ونشر الرسوم وذلك منه حسن ظن وان كنت لست أهلاً لأن الحق بالعلماء في علم من العلوم وفن فسارعت لسؤاله وبادرت الى تحقيق اماله برجاء الأنتظام في سلك العلماء الأكابر فأنجزنا له تدريس فوائد من الفروع والأصول وبسط

موائد الرسوم من المنقول والمعقول. وشهدنا له بالفضل التام. وانه حقيق لأن يعدّ من الأعلام كما أجازني رديف المتقدمين وامام المتأخرين وحيد أوانه وفريد زمانه العالم العامل والحبر الكامل الجامع بين علمي المنقول والمعقول. السائر ذكره الجميل في كل قطر سير المثل السائر قدوة الأنام وعمدة الاسلام استاذي ومولاي ومن تشبث بأذيال افادته يداي المرحوم بكرم ربّه الخفى الجليّ ابوبكر كچك الملا الأربلي...)).

مدرس چەغەمیرە.

أحمد عبدالرحيم- ئيمزا.

أصادق على توقيع المدرس.

مدرس قبلان- ئيمزا.

لقد حضرت الأجازة وصادقت عليها- مدرس دیبەگە اسماعيل محمد- ئيمزا.

انا شاهدت بما حواه ولم يتفوه به احد عن هواه- الكويسنجق ابوبكر- ئيمزا.

له ۱۹٤۹/۱۱/۳دا بووه.



## لە ئیجازەیەکی دیبەگە

لەشارۆچکەی دیبەگە ئیجازەی مەلایەتی دەدرا. لای پاشا شکایەت لە مەلای ڕەش کراو هێنایانە حزوور پاشاو گوتی:

- مەلای ڕەش دەڵێن: تۆ بۆ جاسووسی هاتوویت؟.

- ئەفەندم ئەگەر بۆ جاسووسی بووایە لەو کوێرە دێیە نەدەکەوتمو ساڵێك، دووان، بۆ ئیخباری بردن هەر دەچوومەوە.

- دیارە لەبرسان هاتوویت؟.

- ئەگەر لەبرسان بووایە هەر بە تەنیا نەدەهاتم خەڵکی تریشم لەگەڵ دەهات.

- ئەدی بۆچی هاتوویت؟.

- زانیم شاری هەولێرو دەوروبەری (دارولجەهلە)و هاتووم عیلمو عیرفان بڵاو بکەمەوە. سوپاس بۆ خوای مەزن هەتا ئەمڕۆ عیلمێکی زۆرم بڵاو کردووەتەوە.

پاشا هەرکە وەڵامەکەی بیستو گوتی:

- کەواتە بڕۆن خەڵاتی بکەنو بەڕێزەوە بیبەنەوە شوێنی خۆی.

پارچە حەسیرێکیان لەپشت قایم کرد. گوایا جوبەو خەڵاتی پاشایە.

چوار زەفتییەی پاشا بەرماڵێکی نوێژیان راخستو مەلای ڕەشیان لەسەر داناو بەچوار دەستەو دەنگی (فڕ.. ڕ.. ڕ) گوایات تەیارەیەو بردیانەوە شوێنی خۆی.



# ڕیبا حەڵاڵ کردن

ئاغایەك، دوای تاپۆکردنی زەوی‌و زاری ناوچەکە ساڵی (١٩٢٧-١٩٢٨)دا لەلایەن (مستەر لاین)و لە مەحکەمەدا شکایەت لەدوازدە (١٢) جوتیاری گوندەکەی خۆی دەکات. زەوییەکانیان لەسەر خۆیان تاپۆ کردبوو..و سوێند بەدرۆ دەخوات: (من بە (٣٠٠) سێ سەت دینار زەویی ئەو دوازدە کەسەم کڕیوە). مەحکەمەش بڕیار دەدات: یان (٣٠٠) سێ سەت دینارەکەی ڕەت کەنەوە، یان زەوییەکانتانی بدەنێ.

ئەوەندە پارەش لەسەرەتای چلەکانی سەدەی رابردوودا بە جوتیارەکان پەیدا نەدەکرا.

جوتیارەکان پەلیان لە عەردی براو نەیاندەزانی چۆن زەوییەکانیان لەدەمی گورگ دەرباز بکەن.

پیاوی لێزانو دنیادیتەی دەوروبەریان وەبەرگوێیان هەڵدەدەنو:

- (پیاوبن زەوییەکانتان مەدۆڕێننو بڕۆن لای حکومەت بە (٣٠٠) دینار لەرەهنی دانێن).

ویستیان بچن، بەس بیستبوو یان: (زەوی لەرەهن دانان بە پارە ڕیبایە). ئەمەش ئەوسا گەلی کورد خۆیان زۆر لێدەپارێزت. لەچەند مەلایان پرسی بە هیچ جۆرێك

ڕێیان نەدان. بەمە پێیەکییان کەوتە پێش‌و پێیەکەی تر کەوتە پاش. دوای مشوور خواردن‌و تەکبیرێکی زۆرەوە چوار پێنجێکیان دەچنە لای مەلای ڕەش‌و یەکسەر پێیان دەڵێت:

– تا زووەو زەوییەکانتان لە قیس نەچووە بڕۆن لەڕەهنی دانێن. هەر کەس گوتی: ڕیبایە بڵێن: (مەلای ڕەش فتوای بۆ داوین). بەم تەرزە زەوییەکانیان ڕزگار دەکەن.



# فتواکە

هێندێك لە ئاغاکان بەفتواکەی مەلای ڕەش شێت‌و هاردەبن‌و لەسەرانسەری ناوچەکەیان بڵاوکردەوە: (مەلای ڕەش: ڕیبای حەڵاڵ کردووە).

بۆ ئەوەی بەسەر مەلای ڕەشدا زاڵ بن‌و ریسوا ببێت. کۆبوونەوەیەکی گەورەیان بەگشت مەلاکانی ناوچەو دەوروبەری دەکەن.

مەلای ڕەش لەنێو مەلاکاندا دەڵێت:

– بەڵێ من فتوام داوەو پێموتن: (لەبەر ئەوەی زەوییەکانیان هۆی ژیانیانەو هۆی تر نییە پێ بژین. دروستە لەڕەهنی دابنێن).

ئەمەش یەکسەر لەلایەن ئەم خوالێخۆشبووانە (مەلا مەعسومی کۆیی‌و مەلا ئەبووبەکری دووگردکان پەسند کرا). لەئەنجامدا بۆچوونەکەی مەلای ڕەش سەری گرت.

(لەبەر باری کۆمەڵایەتی نەمانتوانی: ناوەکان بڵێین.. نووسەر).



# پارە کۆکردنەوە

ساڵی (١٩٤٤)ی زایینی (گرانەتا) لەناوچەی کەندێناوە بڵاودەبێتەوە ماڵ هەبوو دەرکەی پێوەدرا. لەگوندی چەغەمیرە دایكو کوڕو کچێکی کوشت. کیژی مەلای ڕەش جاحێلو تەونکەر بوو، ئەوسا ئافرەتی کورد بەدەگمەن تەونی دەزانی وەفاتی کرد.

عەزیزی کوڕیشی گوێی چەپەی بەگرانەتاکە کەڕبووە.

لەبەرئەوە ئەو خوالێخۆشبووانە: (حاجی جوکلو فەتاح ئاغا)ی برای (کانەبی ئاغا) ساڵانە لە عەڵبە برنجێکیان پتر دەدا مەلای ڕەش، خواردنیش ئەوسا زۆر کەم بوو..و باشترینی شۆربا برنج بوو. دەست هەموو کەس نەدەکەوت. لەکاتی کەتنی منداڵەکانی مەلای ڕەش شۆربای برنجیان زۆر دەدرایێ کچێکی لەو ڕۆژەوە برنجی لەبەرچاو کەوتو هەتا مردیش نەچووە سەر زاری.

ئا.. لەم تازیەدا مەلا ناودارەکانی شاری هەولێرو دەوروبەری دەچنە لای مەلای ڕەشو دەڵێن:

(دەبێ لەگەڵمان بێت هێندە پارە لەو گوندانە کۆکەینەوە پێ بچینە بەغداو ئیمتیحانی فەقێیان نەهێڵینو مەعاشیش بۆ ئێمەی مەلای ببڕدرێتەوە).

مەلای ڕەش دەڵێت: (من معاشم ناوێت بەڵام لەبەر ئەوە خزمەتی فەقێیانی تێدایە ئامادەم).

دێ بەدێ دەگەڕێن. لەئاوایی (گابەڵەکە) گوندێکە لەناوچەی کەندێناوە، میوانی دیوەخانی خوالێخۆشبوو (حاجی سادق) پیاوێکی بەخشندەو ناوداری سەردەم بوو دەبن دەڵێتە خەڵکەکە:

(هەموو ڕۆژ گورگ بەسەر سەدەی مەحموود بایز دانا یەت. واتە هەموو ڕۆژ مەلای ڕەش نایەت).

دوازدە دینار خڕ دەکەنەوە. ئەوسا ئەو پارەیە یەکجار زۆر دەبێت. مەلای ڕەش ئەوسا ڕووی تێدەکاتو دەڵێت: (ئەو پارەیە بۆ ئێوە گەلێك زۆرە). واتە بە هەوەنتە پەیدا نابێت.

لەلایەکی تر دەڵێت: (بۆ ئێوە گەلێك کەمە).

واتە ئێوە پیاوی بەخشندەو پیاون ئەو پارەیە نرخی نییە.

هەرکە مامۆستایانی ناوبراو دەچنە بەغدا پێیان دەڵێن: (فەقێ بەچەند ساڵ خوێندن تەواو دەکەن؟).

ئەوانیش دەڵێن: (بەدوازدە ساڵ).

- کەواتە تا فەقێ عەسکەری نەکەن با دوازدە ساڵان ئیمتیحان بدەن.

ئیمتیحانی پێشتریش شەش ساڵ بوو..و لەسایەی هەوڵی ئەوان بوو بەدوازدە ساڵ. موچەی مانگانەی (١٢) دوازدە دینار بۆ خۆیان بڕییەوەو ڕێ و ڕێ گەڕانەوە.

لەسەرتاسەری شاری هەولێرو دەوروبەری بڵاوبووەوە مەلاکان پارەکەیان بۆ (...............)[1].



# بەهرەو زیرەکی

١- مەلای ڕەش هەرکە گوێی دوو جار تا.. سێ جار لە عیبارەتێك بووایە دەهاتە بەری و لەبیریشی نەدەچووەوە.

خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا (عەبدولکەریم)ی مودەڕیس دەیفەرموو: (هەتا ئێمە عیبارەتێکمان دەرخ دەکرد چاومان دەچووە پشتە سەر، کەچی مەلای ڕەش، بە سێ جار خوێندنەوە، دەهاتە بەری و لەیادیشی نەدەچووەوە.

٢- لەچیرۆك و حیکایەت گوتندا بێ هاوتا بووە. زۆر جار وابووە شەوانی درێژی زستان، لەکۆڕی پیاوماقوڵ و جوامێرانی ئاوایی و لاییدەدا حیکایەتێکی دوو سەعات و سێ سەعاتی گوتووە. هەرکە لێ بووەتەوە، جەماعەتەکە لێکڕا دەست

1- من ئەمەی بەڕەوا نازانم، بەڵام مێژووی هەڵسوکەوت و ڕێزگرتنی باوکمەو نەمتوانی بیخەمە بن کەندووان. داوای چ چاوپۆشین لە نەوەی مامۆستایانی ناوبراو دەکەم.. نووسەر.

خۆشیان لێکردووەو: (بەخوا بابە حیکایەتێکی زۆر خۆش بوو. بەعەمری خۆمان ئەو تەرحە حیکایەتەمان نەبیستووە).

ئەویش دەیگوت: (بەخوا منیش یەکەم جارە گوێم لەم حیکایەتە بێت). واتە بەخۆی هەڵیدەبەستا.

مندال بووم زۆر جار شەوانی زستان حیکایەتێکم لەخەڵکی ئاوایی، یان پیرێژنێك دەبیست، لەماڵەوە بۆ خوشك و براکانم دەگێڕاوە. باوکم دەیگوت: (ڕۆڵە هەر درۆیە.. بۆ.. وا بە پچڕ پچڕو شپرزەیی دەیگێڕیتەوە) ئەوجا هەمان حیکایەت بەشێوەیەکی زۆر باش و ڕێکتری دەگێڕاوە.

نەخاسمە هەرکە پاڵەوانە سەرەکییەکە، بەرەو شوێنی تۆڵە سەندنەوە دەچوو جۆرە شیعرێکی سۆزداری بە باڵای پاڵەوانەکە هەڵدەدا، زەوقی گوێکری یەکسەر بکێش دەکرد. کەچی بەداخەوە شیعرەکەم لەبیر نەماوە.. (نووسەر).



# زانست و زانیاریی غەیری مەلایەتی

مەلای ڕەش جگە لەزانینی عیلم و زانستی مەلایەتی دەستێکی باڵای لە ئەمانە هەبووە:

١- مێژوو و جوغرافیا. شارەزاییەکی تەواوی لەم دوو وانە هەبوو، نەخاسمە نەخشەو خەریتەی جیهانی. باسی هەر وڵاتێك بکرابوایە یەکسەر باسی نەخشەکەی دەکرد.

٢- لەسیاسەتی دەوڵەتان: تایبەتی سیاسەتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا. کەس نەبوو ئەوسا خۆی لەقەرەی بدات. بۆ دڵنیایی فەرموون سەیری ئەمانە بکەن:

أ- هەرکە میسر لەگەڵ ئینگلیز و ئەمریکا بەشەڕ هات، مەلای ڕەش دەڵێت: (ئافرەتێك چل ساڵ ژنی پیاوێك بێت چۆن دەسەڵاتی بەرەنگاربوونی دەبێت).

گوتیان: (مامۆستا ڕووسیای لەپشتە). ئەوکات دەوری زۆر هەبوو، گوتی: (دە بڵێن نێرەکەری سووری لە پشتە).

ب- کاتی شەڕی جیهانی، ئەمەش بەدوورو درێژی باس کراوە پێویست ناکات دووبارە چیرەی بدەینێ.

٣- (علم العقد- زانینی گە): هەر حسێبێك باس بکرابووایە مەلای ڕەش یەکسەر بە پەنجە وەك ئالەی حاسیبەی ئەمڕۆ لێکیدەداوە. بۆوێنە:

لەدیوەخانی خوالێخۆشبوو (عەلی مەحموود کاکەخان)دا ئەمە باس کرا:

(نۆ نوردی نان، هەر نوردی نۆ نان نۆ نان، هەر نانێ نۆ کفتە لەسەر، هەر کفتەی نۆ پشیلەی لەسەر، هەر پشیلەی نۆ فەرخە لەبەر).

ئەحمەدی کوڕی عەلی ئاغا لەمەرحەلەی چواری کۆلیژی (ماف) بوو. دەستی دا قەڵەم و مەلای ڕەشیش بە پەنجە، پێش ئەحمەد بە چەند دەقیقە زانی، چاویشی ئەوسا بەر خۆی نەدەدیت.



## شت لەبیر نەچوون

خوالێخۆشبوو مەلا ئەحمەدی قەرەبەگ کتێبی (جەمعولجەمیع)ی لای مەلای ڕەش دەخوێند.

خوالێخۆشبوو مەلا تاهیری کەنداڵە قەڵ سەماعی دەکرد.

(سەماع) ئەوە بوو: موستەعیدێك هەرکە دەرسی لە کن مەلا دەخوێند موستەعیدێکی تر هەمان کتێبی دەبردو دەچووە لایان، بەبێ دەنگ دادەنیشت و گوێی لە ماناکەی مەلا رادەگرت.

مەلا ئەحمەد.. دوو ڕۆژ بوو لەسەر مانای یەك بابەت نەدەڕۆیشت.

ڕۆژی دووەم مەلای ڕەش پێیدەڵێت:

- مەلا ئەحمەد بۆ.. ناڕۆیت؟.

ئەویش دەڵێت:

- حاشیەکی بەنێنانی هەیە دژی تەقریرەکەی جەنابتە.

- تۆ خوا دوو ڕۆژە مەلای ڕەشت لەسەر بەنێنانی ڕاگرتووە!.

ئەوسا دەڵێت:

- سی ساڵ بەر لە ئەمڕۆ لەبیارەی شەریف (نەجاڕی)یەکم لێرە دیتووە ماناکەی باش لێداوەتەوە.

مەلا تاهیر ئەوسا دەڵێت:

- مامۆستا نەجاڕییەکە لای من نووسراوەتەوە.

- ئەی بۆ دەنگ ناکەیت؟.

- مەلا ئەحمەد نامێڵێت.

ئەوسا نەجاڕییەکەی دەخوێنتەوە.



# خوریکە

ساڵێک (لەیاد نەماوە چ ساڵێک بوو)، خوریکە کوت بۆ یەکەم جار دەچێتە ئاوایی (چەغەمیرە). مەلای ڕەش بەخەڵکەکە دەڵێت: (دەبێ هەمووتان منداڵتان بکوتن).

منداڵی ئاوایی لێکرا دەکوترێن: تەنیا خوالێخۆشبوو: (سلێمانی مەلۆك پیاوێکی ئاوایی بوو کچێکی دەبێت و قەرەنی براشی کوڕێك دڵیان نایەت بیانکوتن: هەردووکیان دەشارنەوە).

خوریکە پەیدا دەبێت تەنیا لەو دوو منداڵە دێت و هەردووکیان چاویان کوێر دەبێت. کچەکە ئێستاش لەژیاندا ماوەو لەگەڕەکی تەیراوە دادەنیشێت و (لەعلی کۆر)ی ناوەو کوڕەکەش (سەلیمە کۆر)ی ناوبوو نەماوە.



# گوێزە گوێز

تالبەشێتی سلێمانی ناوبراو ئاوزەی عەزیزی مەلای ڕەشە. تاتەمەنی (١٢) دوازدە ساڵی بەیەکەوە بەسەردەبەن و دڵیان بەئاستەمیش لەیەك نەپێشاوە، مام سلێمانی ساڵی (١٩٥٣) باردەکات دەچێتە دیبەگەو ئەو دووانە لەیەك دادەبڕێن.

تالب عەمری دوازدە ساڵ دەبێت باوکی دایکی تەڵاق دەدات. هەرکە دەبێتە مامۆستا حەزی دەچێتە ئافرەتێك و نایدەنێ. ئەم دوو نەگبەتە کاری لێدەکەن و شێت دەبێت.

تالب هەر کاتێك چاوی بە عەزیز دەکەوێت دەڵێت: باوکت هەرکە دەگەیشتە من دەیگوت: (گوێزە گوێزی بلوێرە، کوێرەی دەبەین بۆ کوێرە).

نەیدەزانی مەبەستی چییە تاکو عەزیز پێیدەڵێت: (نیازی لەعلی کۆری خوشکت بۆ (سەلیمە کۆر)ی ئامۆزاتی دەبەین).



# سەفارچی

لەنیوەی سەدەی رابردوو.. و بەولاوە: (سەفارچی) دەهاتنە دەشتی هەولێرو هیرباری سفریان سپی دەکردەوە. بەزۆریش خەڵکی ناوچەی هەورامان بوون.

ڕۆژێك (ساڵەکە لەیاد نەماوە) سەفارچی دەچنە ئاوایی (چەغەمیرە)و لەماڵی خوالێخۆشبوو (مام حەمەدەمین کارەوان)ی دراوسێی مەلای ڕەش دەیەخن. لەژوورێدا دەبن لەگەڵ ژووری نووستنی مەلای ڕەش دیوارێکیان نێوان دەبێت. شەویەك سەفارچییەکان دەست بە گۆرانی هەورامی دەکات. مەلای ڕەش بە گۆرانی هەورامی وەڵامی دەداتەوە. نزیکەی دوو سەعاتی خایاند. هەرکە ماندوو بوون سەفارچیەکە گوتی:

- ئەوا کاسبی و نان پەیدا کردن ئێمەی گەیاندووە ئێرە ئەی جەنابت؟.
- منیش مەلایەتی.

مـن ئەوسـا دوازدە سـاڵ دەبـووم یـەك وشـە چـییە لەگۆرانییـەكان نەگەیـشتم.. نووسەر.

## زەكاتیان لەسەر نییە

لەتازییـەكی عەشیرەتی شێروانیان ئـەم خوالێخۆشبووانە دانیـشتبوون: (كانـەبی ئاغـا. كوێخـا تـاهیری دارەخورمـا. مـەلا موحەدمـەدی شـێروانی. حـاجی مـەحموود شێروان. حاجی ئیبراهیم ڕەشی كاریتان و چەند جوامێری ئاوایی). مـەلای ڕەش لـەو كاتەدا ڕوو لە مەلا موحەمەدی شێروانی دەكات و دەڵێت:

– ئێرە دێیەكەی خۆت نییەو پرسیارێكت لێدەكەم؟.

– فەرموو.

– فەلاحی چەغەمیرە زەكاتی شەرعیان لێدەكەوێت؟.

– من نازانم.

– پێم گوتی: ئێرە چەغەمیرەیە، قەپڵانی گوندەكەی خۆت نییە.

دووبارە دەڵێت:

– نازانم.

– دامانـنـا جوتیارێـك (٤) عەڵبـە دەغڵـی چـاندو لـەو سـەری یـەك و هەشـتی بـڕی. دەكـات (٣٢) سـی و دوو عەڵبـە. شـەش عەڵبـەو نزیكـەی (٣) قـەزناخ تـاپۆی ئاغایـە. ماوەی (٢٥) عەڵبەو (٧) حەوت قەزناخ.

(٤) عەڵبە بنەتۆیەكەی خۆی لێدەركە، ماوە (٢١) عەڵبەو (٧) حەوت قەزناخ.

دوو عەڵبەش كرێی جوتیار. (١٩) نوزدە عەڵبـەو حـەوت قـەزناخ مـاوە. مەسرەفی شۆبڕین و.. وەردانـەوەو تـۆكردن و ئـاڵێكی وڵاخ دابـنێ (٤) چـوار عەڵبـە. مـاوە (١٥) پازدە عەڵبەو حەفت قەزناخ.

حـەقی سەپانیش شەشێكە، دەكاتـە نزیكـەی (٥) پێـنج عەڵبـەو (٣) قـەزناخ. مـاوە (١٠) عەڵبەو چوار قەزناخ. كرێـی تێلـەكێش- گیـشەكەر (٤) چـوار قـەزناخ. مـاوە (١٠) عەڵبە.

زەکاتی شەرعیش بیستی دووە- (١٠٪)و نزیکە (٣) سێ عەلبەو قەزناخ و نیو دەکات. ماوە (٦) شەش عەلبەو نزیکەی (٦) شەش قەزناخ و نیو.

تۆ خوا جوتیارێك ساڵ دوازدە مانگ بەخۆی و خاوو خێزانەوە ماندوو..و هیلاکی سەرماو گەرما بۆ (٦) شەش عەلبە دەغڵ. چ بکاتە مەسرەف و چ بخوات. بۆیە من دەڵێم: چەغەمێرەیی زەکاتی شەرعیان لەسەر نییە.

پاشدان دەڵێت:

- ڕۆژی قیامەت خوای گەورە بە خەڵکی چەغەمیرە دەڵێت: (ئێوە زەکاتتان داوە؟).

ئەوانیش دەڵێن: (بەڵێ زەکاتی بیست و چوارمان داوە).

- داوتانە کێ؟.

- دایتمانە کانەبی ئاغا.

- کانەبی ئاغا وایە؟.

- بەڵێ وایە.

- ئەوجا خوا بەچەغەمیرەییان دەڵێت: (ئەوا بیست و دووتان وەبەر زەکاتی شەرعی دەیەخەم و بای بیست و دووەکەی ترتان گوناحی ئێوە دەخەمە سەر کانەبی ئاغا).

ئەوجا ڕوو لە حاجی ئیبراهیم دەکات و دەڵێت: (بەلام حاجی ئیبراهیم تۆ زەوییەکەت موڵکی خۆتە، ئەگەر یەك ڕبە زەکاتت لابمینێت خوا عەزابت دەدات.

لەو ڕۆژەوە چەغەمیرەیی زەکاتی شەرعیان دەرنەدەکرد.



## شەڕی جیهانی

لەکاتی شەڕی جیهانی دووەمدا بنەماڵەی (بایزی) کە تیرەیەکی سەرەکین لە ئاغەواتی دزەیی تازییەیان دەبێت.

(ئەگەر نەبێتە درۆ: ئاغای ئەحمەدی بایزی وەفاتی کردبوو.. نووسەر).

تازییەکە یەکجار قەرەباڵغ دەبێت.

گەلی کورد ئەوسا بە بتوونی لایەنگیری ئەڵمانیا دەبن. هێندێك لەدانیشتووان دەڵێن: (بە ئەوەندە ڕۆژەی دی.. (ژمارەی ڕۆژەکان لەیاد نەماون)- ئەڵمانیا ڕووسیای بەتەواوی دەگرێت).

مەلای ڕەش لەتازییەکە دەبێت و بەپێچەوانەی بۆچوونی ئەوان دەڵێت:

- نەك بەو ماوەیەی دەڵێن، بگرە بە سێ هەندەتریش بۆی ناگیرێت و بگرە خۆی تەسلیم دەبێت.

خوالێخۆشبوو: (حوسێن مەلا) ئەوسا یەك لە پایە بەرزەکانی ئاغاواتی دزەیی بوو..و دەڵێت:

- مەلای ڕەش ئەوە ئیشی تۆ نییە. بۆ خۆت بڕۆ چەغەمیرە (قال المصنف)ی بڵێیتەوە باشترە.

- حوسێن ئاغا ئیشی تۆ ئەوەیە بچێتە سەرگردی ئاوایی (قازیخانە) بانگی پیرێژنە کرمانجان بکەیت ئەستورکە جۆ..و کۆتکە دۆت بۆ بێنن قوون پێ ئەستوور بکەیت. ئەوە ئیشی منەو زیاتریش.

قائیمقامی قەزای مەخموور بە بۆچوونەکەی مەلای ڕەش ڕووگرژ دەبێت، بەڵام دەنگ ناکات، کەچی معاون شورتەی مەخموور ڕووی تێدەکات و دەڵێت:

- مامۆستا من زۆر چاك شارەزاتم: خەریتەی گۆی زەوی وەك ناو لەپت وایە ئەوەندە لێی مەعلانیت بەچی دەزانیت: ئەڵمانیا سەرناکەوێت.

- کاکە ڕاستە ئەڵمانیا بەهۆی چەك و عتادەوە، دەرەقەتی ڕووسیا دێت، بەڵام سوپاکە ئەوەندە (ماوەکە لەبیر نەماوە)ی لێ دوورکەوتووەتەوەو شوێنەکەشی زۆر ساردو بەستەلەکەو ئازووقەی زۆر بەزەحمەت دەگاتێ و چەك بەچی کەلك دێت کە سەرماو برسێتی هورووژمیان هێنا. بە بۆچوونی من بەو ماوەیەی دەڵێن لەسەرمان و لەبرسان، بەبێ شەڕ تەسلیم دەبێت، ئیتر بەو ماوەیەی گوترا ئەڵمانیا تەسلیم بوو.

●●●●●

# نائیب نائیب

لەسەرەتای پەنجاکانی سەدەی رابردوودا، بۆ هەڵبژاردنی نائیبو سەرەك وەزیرانی حکومەتی عێراق کێشە لەنێوان (نوری سەعیدو ساڵح جبر) دەبێت. وابڕیاربوو کێ لەهەڵبژاردن دەرچوو دەبێتە سەرەك وەزیران.

لەشاری هەولێرو دەوروبەری ئەو خوالێخۆشبووانە (مەعروف ئاغای باقرتو خدری پاشا) خۆیان بۆ نائیبی تەرخان کرد.

یەکەمیان سەر بە ساڵح جەبرو ئەویتر سەر بە نووری سەعید بوو. لەشارو گوندەکان دەست بەهەڵبژاردن کرا.

خوالێخۆشبوو (حەسەن ئاغا)ی چەغەمیرە، بە مەلای ڕەشی گوت:

- مامۆستا دوعامان بۆ بکە ساڵح جەبر دەربچێت.

ئەویش گوتی: (تا گورگ= نوری سەعید لە گۆڕێ بێت، بزن= ساڵح جەبر قیمەتی نییە).

حەسەن ئاغا زۆری پێناخۆش دەبێت، بەڵام دەنگ ناکات. زۆری نەبرد ساڵح جەبر بەزۆری دەنگ دەرچوو.

حەسەن ئاغا بەوپەڕی خۆشحاڵیو هەلەداوانەوە بە مەلای ڕەشی گوت:

- (مامۆستا ساڵح جەبر دەرچوو. مامۆستا ساڵح جەبر دەرچوو).

وەك تانەیەك لە مەلای ڕەش. ئەوسا گوتی:

- وادیارە نوری سەعید قەوچی عەمالەتی ئینگلیزی لەسەر کراوەتەوە.

دوو ڕۆژی نەبرد ساڵح جەبریان وەلاناو نووری کرا بە سەرەك وەزیران.



# مەجید

ساڵەکە لەیاد نەماوە: خوالێخۆشبوو (مەجیدی جوکل ئاغا)ی گوندی قۆڕیتان خەریجی کۆلیژی (حقوق) دەبێت. لەتازییەکی خۆیان، لەگەڵ ئەو خوالێخۆشبووانە:

(مەلا عەلی قوڕیتان و مەلا خەلیلی دووسەرەو مەلا سەید موحەمەدی پیرداودی) لەسەر سیاسەتی دەوڵەتان و هەڵسوکەوتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا شتی تر (تەواو لەبیر نەماوە) دەکەوتە گفتوگۆ.. و موناقەشە. لەئەنجامدا هەر سێ مەلا، لەگەڵ مەجید ناگەنە یەك و توورە دەبن و تازییەکە بەجێ دێلن و دەڕۆن.

لەو کاتەدا مەلای ڕەش دەچێتە تازییەکەو.. واریقاتەکە دەزانێت و ڕوو لە مەجید دەکات و دەڵێت:

- (ئەمڕۆ ئیشم هەیەو زوو دەڕۆم، بەڵام بەیانی دێمەوە، تۆش سێ چوار محامیان پەیدا بکەو دەکەوینە موناقەشە).

ڕۆژی دوایی هەرکە مەلای ڕەش پەیدا دەبێت، هەرچی پیاوی گوندەکەیە دەچنە دیاری.

مەجید هەرچەند پرسیار لەو بارەیەوە، کە باسکرا دەکات و مەلای ڕەش بەڕەوانی وەڵامی دەداتەوە. تاکو هیچ پرسیاری لەبار نامێنێت. مەلای ڕەش دەڵێت:

- مەجید چیترت ماوە؟.

- نەخێر.

- سەت محامی وەك تۆ بێت وەك کەر لەقوڕ دەیبەستمەوە.

بە تەوازووەوە:

- مامۆستا لەبەر ئەوە تۆ زانایت وتێمدەگەیت، ئەگەر دەوم لە قوڕەشین بەچەقێنیت و بەپێلەقان لەپشتەسەرم بدەیت شەرت بێت نەڵێم: ئۆف.

بەڵام مەلایەکانی دی ئەو پلەیان نەبوو..و هیچیان نەدەزانی و سەریان لەپرسیارەکانی من دەرنەدەچوو، تاکو.. وەڵامم بدەنەوە. توورەییەکەیان کردە هەنجەتی ڕۆیشتن.

هەیانبوو دەیگوت: ئەو پرسیارانەی تۆ بۆنی کوفری لێدێت.



# خانوو سووتان

ژووری ماڵەوەی مەلا ڕەش ڕووەو کوێستان سێ چاوە بوو. چاوەی ڕۆژهەڵات زەخیرەی تێدابوو. ژووری خۆرئاوا مەلای تێدا دەنووست. ژووری ناوەڕاست، لەژوورەکانی دیکە گەورەتر بوو. بنەبانێی ڕۆژئاوای سەندووقێکی گەورەو دوو دەرکەی هەبوو.. چوار جامی تێدا گیرابوو. جامەکان بەبۆیەی ڕەنگاو ڕەنگ نەخشێنرابوو. یەکیان وێنەی بۆراق و ئیمامی عەلی لەسەر پشتی. یەکێکیشیان وێنەی کەڵەبابێکی لێکرابوو. ناو سەندووقەکان پڕی کەلوپەل و وردەواڵەو بوخچەی جلوبەرگ لەبەر کردن بوو.

زاوییەی بنەبانەکەی تر قوناگردان بوو. لەوەرزی ساردیدا، سبیانان نانی لێدەکرا. مەترو نیوێك بەرەو دەرگا کەرستەی تەون و مافوور لەداریێ بوو.

لەبەردەمی سندووقەکەو بەرامبەر تەونەکە منداڵ بەڕیز دەنووستن. قوناگردانەکە هەردەم پڕکاو کۆت و سوتەمەنی بوو. ڕۆژێك منداڵ ئاگادار نابن برووشکە ئاگر، لەئاگردانەکەوە دەپەڕێتە نێو سووتەمەنییەکەو بڵێسەی بەرز دەبێتەوەو دەگاتە هەراشی خانووەکەو ئاگر دەگرێت.

مەلای ڕەش دێتە دەرەوەو پیاوێك دەبینێت و پێیدەڵێت (هاوار بکە ماڵی مەلای ئاگری تێبەر بوو). کابراش پڕ بەدەنگ هاوار دەکات و خەڵکەکە لە هەر لاوە گەمارۆی ئاگرەکەی دەدەن.

خوالێخۆشبوو (مەلا عومەری مەرزان)ی گوندی گەزۆکی مەرزان موستەعیدی مەلای ڕەش و لەڕووی خێزانیشەوە یەك ماڵ دەبن، بەقەڵەمبڕێك لە دیار تەونەکە رادەوەستێت. ئەگەر ئاگرە گەیشتە تەونەکە بیبڕێت. زۆری نەبرد ئاگرەکەیان، بێ ئەوەی زەرەرێکی ئەوتۆی ببێت کوژاندەوە.

خوالێخۆشبوو پلکە (هەیبەت)ی خێزانی خوالێخۆشبوو (حەمەد باقی) دراوسێی ماڵی مەلا بوون پێنج (٥) جەرە ئاوی بۆ کوژاندنەوەی ئاگرەکە بەم چەشنە هەڵگرتبوو:

دوو جەڕەی بەگوریس لەپشتی خۆی هەڵدابوو. جەڕەیەکیشی لە مەعبێن هەردوو جەڕەکانی پشتی دانابوو. دوو جەڕەشی بەم دەستو بەو دەستو سەری گوریسی جەڕەکانی پشتیشی بەددان گرتبوو. لەبیرێك دەیهێنا لەگەڵ ماڵی مەلا کەندێکی دە دوازدە مەتر قووڵ بوو.



## سەرتاشی مەلای ڕەش

خوالێخۆشبوو مام (ئیبراهیم کارەوان) سەرتاشی ئاوایی بوو. هەموو بەیانی ڕۆژی هەینیان سەرو ریش و بن هەنگڵی مەلای ڕەشی دەتاشی.

ڕۆژێك لەبەربەر بەرۆرچکەی دیواری حوجرەی فەقێیانی چەغەمیرە، لەکاتی ژێر هەنگڵ تراشیندا، خوالێخۆشبوو (میرزای رەسوڵ رۆستەم)ی خزمەتکاری ئاغا تێدەپەڕێت و دەڵێت:

– مامۆستا ئەوێشی پێ بتراشە.

یەکسەر دەڵێت:

– بەسەری باوکت ئەوێم بۆ میرزا هەڵگرتووە.

مام ئیبراهیم زۆر باوەڕی لەڕووی ئاییەنەوە بە مەلای ڕەش دەبێت. لەسەرەمەرگدا پێیدەڵێن:

– وەسیەتێك بۆ خۆت بکە.

دەڵێت:

– وەسیەتم لۆ چییە. نزیکەی بیست و قسوور ساڵ سەرو ڕدێنی مەلای ڕەشم تاشیوە: خوا کوو لێم خۆش نابێت.



# براکانی

مەلای ڕەش لەگەڵ برا گچکەکەی (حەمەساڵح) لەشێوەی دایکیان ڕەش پێست بوونە. ئەو تۆزێك گۆشتن و بەدەنی شل و خاو بووە کەچی ئەمیان لاوازو جەستە توندبووە. هەردووکیان لەژیاندا، لەدیدەن و سەردانی خزم و دۆستان بێ ڕەحم و خەم ساردبوونە. کەچی (حەمەشەریف)ی برا ناوەندییەکەی لە زۆر ڕووان دەتگوت برای ئەوان نییە. سوورو سپی و چاوشین. بەباوکی دەچوو. تێکچەقی و توندو تۆڵ و زۆر بەرەحم بووە.٠تەنیا لە بالاکورتی وەك یەك بوونە.

جارێك بۆ باراش لێکردن دەچێتە دێیەکەی دراوسێیان، پێش شەبەقی بەیان دەگاتە شوێن جۆخینی ئاواییەکە، تارماییەك لەپێشی دیارەو دەمنگێنێت. هەرکە لێی نزیك دەبێتەوە ئەحمەدی برایتی و دەوران دەکاتەوە. پێیدەڵێت:

– ئەوە لێرەیت و نەهاتی سەرم لێ بدەیت.

لەبەر ئەوە برا گەورە بووە. بەپێکەنینەوە پێیدەڵێت:

– کەڕە عەوام بهات بوومایە لات دوو سێ ڕۆژ نەتدەهێشت بڕۆم و دەرسێکی زۆرم دەچوو.

ئەویش لەحەیفان بەگریانەوە لەسەرو سەکوتی خۆی دەدات.



جاری دووەم هەرکە دەزانێت لەگوندی (گەلاڵە)ی ناوچەی سلێمانی بووەتە مەلا ڕۆژێك بە حەمە ساڵحی برای دەڵێت:

– وەرە بەیەکەوە بچین سەردانی بکەین.

ئەویش ڕەزامەندی خۆی بە (باشە) دەردەبڕێت.

بەیانی زوو دەچێتە لای و دەڵێت: (هەستە بابڕۆین).

ئەوجارە من بۆم ناکرێت تۆ بۆ خۆت بچۆ.

بەتەنیا سەردانی دەکات.



جاری سێیەم: هەرکە دەزانێت مەلای برای بەرەو شاری هەولێر چووە بەپێیان هەولێر خۆت بگرەو واهاتم. بەپرسیار لەخەڵکی ئەو گوندانەی لەنزیک هەولێر دەکەونە سەر ڕێگەی وێدەکەوێت مەلای برای لەشارۆچکەی (مەخموور) بووەتە مەلا.

لەبەر ئەوە ڕیشی گەورە بووە، لەئاقاری گوندی (سۆربەشی خدر) تووشی چەند شوانێك دەبێت، شوانەکان دەورەی دەدەن و دەڵێن:

- ئەوە جووە: ئەگەر شەهادە نەهێنیت دەتگیێن.

ئەویش دەڵێت:

- مەمگێن موسولمان دەبم: (اشهد ان لا اله إلا الله واشهد انّ محمداً رسول الله).

ئێوارە لەگەڵیان دەچێتە نێو ئاوایی و تووشی یەکەم پیاو دەبن و شوانەکان دەڵێن:

- ئەو کابرایە جووەو ئیسلامەمان کردووە.

کابرا لەڕەنگ و ڕووی دەزانێت ئیسلامەو پێدەکەنێت و تف لەشوانەکان دەکات.

ئەویش بەپێکەنینەوە دەڵێت:

- تۆ خوا تانەیان گاومە لەدەستیانم ڕزگار بکە.

پیاوەکە ئەوسا جوێن بە شوانەکان دەدات و دەیباتەوە ماڵ:

ڕۆژێك دوای نوێژی مەغریب دەگاتە شارۆچکەی (مەخموور). وێدەچێت لەساڵی (١٩٣٠) دابێت. دەچێتە مزگەوت. ئەوسا دنیا گەرم دەبێت و خەڵکەکە لەسەربانی مزگەوتەکە دادەنیشن. ئەویش هەرکە هەست دەکات مزگەوتەکە فەقێی نییەو پرسیار دەکات و دەڵێت:

- ئەرێ مەلایەك لێرەبوو چیێ لێهات!.

ئەوانیش دەڵێن: (مرد).

لەتاوان تا دەنگی لەبەر دادەبێت دەگرییێت و دەڵێت:

- وەیرۆ.. براڕۆ...، وەیرۆ.. کاکەڕۆ..!.

خوالێخۆشبوو (لەتیفی سمایل قوڵچی) پیاوی ناوداری مەخموورو دۆستی مەلای ڕەش دەبێت، لەسەربانی ماڵی خۆی گوێی لەگریانەکە دەبێت، یەکسەر دەحسێت واریقاتەکە چییەو دەچێتە لای و پێیدەڵێت:

- تۆ.. چ مەلایەك دەڵێیت؟.
- مەلا ئەحمەدی ڕەش.
- چیتە؟.
- برامە.

تومەز دوای مەلای ڕەش، مەلایەك پێش نوێژ لەمزگەوتەکە دەکات ئەمری خوا بەجێ دەهێنێت. یەکسەر دەڵێت:

- بڕوا بکە مەلا ئەحمەدی برای جەنابت نەمردووەو باری کردووەو چووەتە گوندی دێمەکار.

دەیباتەوە ماڵی خۆیو بەیانی زوو بەپیاوو هێستری خۆی ڕەوانەی دێمەکاری دەکات.



ئاخر جار لە گوندی چەغەمیرە، ساڵی ١٩٣٧ دەچێتە لای. ئەوسا عەزیزی برازای لەبەر مەمکان بووە. لەبەر ئەوە بە سەیارە هاتبوو لەشاری کەرکوك دەستی وەبەردەرگەی سەیارە دەکەوێتو ئەستوور دەبێت. حکومەتیش لەهەمان شار چەند ڕۆژێك حەپسی دەکات، لەیاد نەماوە لەسەر چی بووە. هەرکە دەگاتە چەغەمیرە کەلو پەلەکانی زۆر دزوونو ئەسپێون دەبن، خێزانی مەلای ڕەش هەموو شمەکەکانی لەنێو مەنجەڵ دەیانکوڵێنێتو ئەوجا دەیان شوات. ئیتر لەوساکەوە لەبەر ئەوە توانای ڕۆیشتنی بەپێیان نەمابوو نەشدەوێرا سواری ئۆتۆمبێل ببێت. پێ تێکدەچوو بڕای بڕ نەهاتەوە.

لەدێی چەغەمیرە چەند ڕۆژێك دەمێنێتەوە. ڕۆژێك مەلای ڕەش دەبینێت لەگەڵ چەند کەسی ئاوایی دامە دەکات، لەدڵەوە زۆر لێی پەستو دڵگیر دەبێت. لەماڵەوە پێدەڵێت: (یاخوا پاشبەرد کوێر بێتەوە.. کە تۆ..و حاجی قادری لێ بووە).

(حاجی قادر پیاوێکی قسەرەوانو نوکتەچی بووە).

مەلای ڕەش دەڵێت:

- بۆ کەرە عەوام؟.

- عەیب نییە لەگەڵ منداڵو تواڵان یاری دەکەیت. باشە ئەگەر ریزێکیان لێکردی.

حەمەشەریف لەمێندە شتان زوو هەڵدەچوو، کەچی مەلای ڕەش مەگەر بەدەگمەن. پێیدەڵێت:

- ئەگەر ریزێکیان لێ کردبوومایە ئێوارە بۆتم دەکردە ترخێنە.

مەلای ڕەش نۆبات تەعلیقێکی لێدەدا، ئەخاسمە لەسەر ریشە گەورەکەی دەیگوت:

- شەریف تۆ خوا ئەو ریشە موبارەکەتم بۆ جێ بێلە تاکو ناوە ناوە زیارەتی بکەم.

- وەڵلا داوێکی بەڕۆحت نادەم.



پاش (٢١) بیست و یەك ساڵ تێپەڕین بەسەر ئەم دیدەنە مەلای ڕەش وەفات دەکات. بە شەش مانگ خەبەرەکەی پێدەگات تاکو لەخۆ دەچێت دەگرییێت.

لەناوەڕاستی ساڵی (١٩٥٨) سەدەی رابردوودا عەزیز بۆ یەکەم جار چوو ئەوانی دۆزییەوە. لەو ڕۆژەوە ئامەشۆیان گەرم و گوڕ دەبێت. تاکو لە (١٩٨٦/٥/١١)دا لەشاری سلێمانی و لەتەمەنی (٨٧) هەشتاو حەوت ساڵیدا وەفات دەکات و لەگردی سەیوان نێژرا. براکەی تری پێش ئەوەی عەزیز بچێت ئەمری خوای بەجێ گەیاندبوو.



حەمەشەریف زۆر بەدین بووە. ساڵی بەلای کەمیەوە شەش مانگ بەڕۆژوو بووەو لەژیانیشدا درۆی نەکردبوو. خەڵکی ناوچەکە بەئاغاو کرمانجەوە بڕوایان زۆر پێ هەبوو. بە هەر کێشەو گرفت و مەسەلەتییەك هەڵ بستبووایە هیچ کەس حەدی نەبوو پەنجە لەپەنجەی هەڵبدات و دژی بووەستێت.

جارێك هێندە تووتنی خۆشکراو بۆ خێزانی مەلای برای دەهێنێت. بۆ ئەوەی لەسەیتەرە لێینەگرن هەر قیچ قیچ داوێتە نێو جوڕکێکی بچووك و گلۆرە بەنی لەسەر هەڵکردبووەوەو لەنێو فەردە گوێزی دەنێت. بەنەکە براژنی بۆی دەکردە مافوور. لەیەك لەسەیتەرەکان پێیدەڵێن: (خاڵە ئەوە هەر گوێزە؟).

ئەویش دەڵێت:

- نەخێر کوڕ باوکم توتنیشی تێدایە.

- بۆ وادەڵێیت: نازانێت توتن قاچاخە؟.

- بەڵێ دەزانم، بەڵام بەعەمری خۆم درۆم نەکردووە، تازەش بەو ڕیشە سپییەمەوە نایکەم. بۆ برازام لەشاری هەولێر دەیەم دێلن باشە، نایێلن فەرموون دەریبێنن.

ئیتر ئیزنی دەدەن.



زەوی گوندی پاشبەرد، کە لەباپیرانەوە بۆ مابووەوە، حەمەشەریف سەرپەرشتی دەکرد. حەمەساڵحی برای دەچێتە دێی (لال هۆمەرە) لەنزیک گوندەکەی خۆیان.

حەمەشەریف سێ کوڕی دەبێت. ناوی عەسکەریان دێت، پۆلیسی شارۆچکەی پێنجوێن تەبلیغیان دەکەن. ئەویش نایەوێت منداڵەکانی عەسکەری بکەن. ئەمە ناچاری دەکات بچێتە گوندێکی لاچەپ. سەر بەشارۆچکەی ناوبراو نەبێت. لەئاوایی (مەلکەتێن)ی سەر بەناوچەی چوارتا دەسەنگرێتەوە.

چەند ساڵێك زەوییەکەی پاشبەرد خەڵك بەکرێی دەعەمەل دەهێنان تا پێشمەرگە پەیدا بوو. ئەوسا بنەماڵەی خوالێخۆشبوو (شێخ مەحموود) دەست بەسەر زەوییەکە دادەگرن.

حەمەشەریف دەسەڵاتی ئەوانی نابێت و خۆی بێدەنگ دەکات تا بەیانی ١١/ی ئاداری ساڵی (١٩٧٠) بەرپا بوو. بۆ ئەوەی زەوییەکەی وەرگرتەوە ڕوو لەماڵی عەزیزی برازای دەکات و دەڵێت:

- هاتوومە لەگەڵم بێیت بۆ حاجی ئۆمەران لەبارەگای بارزانی داوای زەوییەکەم دەکەمەوە.

- دوو سێ ڕۆژ پشوو بدە ئەوجا دەچین.

- نا.. ئاغاکانی لای ئێمە ئێستا لەوێنەو بەڵێنیان داوە یارمەتیم بدەن.

ڕۆژی دوایی چوون. لەسەیتەرەی شەقڵاوە ئینزباتێکی عەسکەری داوای هەویەی کردو دایانێ. هەرکە داوای لە حەمەشەریف کرد یەکسەر دەستی خستە سەر کۆشی و

گوتی: (تفەزەل).

ئینزباتەکە ماوەیەك پێی شین بووەوەو پاشدان گوتی:

- حەجی هەویەتەك ماشی. حەجی هەویەتەك ماشی.



خوالێخۆشبوو (ڕەحمان ئاغا)ی دێی (نۆڕك)و (حەمەدەمین ئاغا) گوندی (زییە) لەحاجی ئۆمەران بوون. حەمەشەریف دەبینن، ئەوجا دەچنە بارەگای خوالێخۆشبوو (ئیدریس بارزانی). ئاغاکان ڕوو لە ئیدریس بارزانی دەکەنو دەڵێن:

- ئێستا پیاوێکی پەختیاری لای ئێمە دێتە لات، ئەگەر ئازای نانی دەرخوارد دەدەیت.

هەرکە بۆ ژوورەوە دەچێت ئیدریس لەبەری هەڵدەستێتو دوای بەخێرهاتنێکی گەرمو گوڕەوە دەڵێت:

- لەڕێگەی دوورەوە هاتووەو برسییەو بڕۆن نانی بۆ بێنن بخوات.

بێ پەردەی شەرمەوە:

- قوربان نانی ئێوە حەرامە ناتوانم بیخۆم.

- بۆ حەرامە!؟.

- ڕەنگە بەخۆتو جەنابی بارزانی بە کاسبی پەیداتان کردبێت. بە زۆر لەمو لەوتان سەندووە.

دەیەوێت هەندە پارەی بداتێ وەرناگرێتو دەڵێت:

- قوربان من بۆ سواڵ نەهاتوومە، بۆ حەقی خۆم هاتوومە.

هەرکە پارەکەش وەرناگرێت، ئیدریس پێیدەڵێت:

- مادام نانی ئێمەت نەخواردو پارەشت وەرنەگرت، من بێمە ناوچەی ئێوە سەت (١٠٠) پێشمەرکەت، لەتۆڵە بەسەر وەردەکەم.

- قوربان زۆر زۆر (١٠) دە کورە مەرەزتان بۆ دەکوژمەوە.

ئیدریس ئەوسا دەزانێت، بۆ حەقی خۆی هاتووەو لەفرتو فێڵ دوورە کاغەزێکی دەداتێ بۆ (شێخ موحەمەد) ئامیر هێزی (خەبات)ی ئەوسا داوای لێدەکات بەزووترین کات زەوییەکەی بۆ وەرگرنەوە. ئەویش کاغەزەکەی پشت گوێ دەخات.

جاری دووەم لەگەڵ عەزیز چوون کاغەزی دووەمیان هێناو تۆزێکیش هەڕەشەی تێدا بوو. هەنئۆب پشت گوێی دەخات.

کەڕەتی سێیەم هەڕەشەیەکی یەکجار زۆرو لامواپە ئەگەر نەبێتە درۆ لە ئامیر هێزی دەیەخێت، ئەوجا زەوییەکەی تەسلیم دەکەنەوە.. نووسەر.

حەمەشەریف هەرکە زەوییەکەی هاتەوە دەست دەلحاز دەیفرۆشێتو پارەکە دەکاتە سێ بەش. بەشێك بۆ خۆیو دوو بەشەکەی تریش بەسەر بنەماڵەی هەردوو برا بەش دەکات. هەرکە شۆڕشی ئەیلوول نسکۆی هێنا بنەماڵەی شێخی گۆڕین دەست بەسەر زەوییەکە دادەگرنەوە.

حەمەشەریف ناچار دەبێت پارەکە خڕدەکاتەوەو بۆ ئەو کەسەی دەباتەوە کە زەوییەکەی لێ کڕی بوو.



# ڕاپەڕینی جوتیاران

ساڵی (١٩٥٣) لەبەر زوڵمو زۆرداررییەکی لەڕابەدەر زۆری ئاغاکان لەجوتیاران کە بەنووسین نانووسرێتەوە (حیزبی شیوعی) توانی لەگوندی (قازیخانە)ی ناوچەی قوشتەپە ڕاپەڕینی جوتیاران بەرپا بکات. گوند هەبوو نەیاندەزانی شیوعیەت چییە، بووە چاولێکەریو... وەك ئاگری (بڕە سۆرە) وەبەردەچوو. لە هەر ئاواییەکدا خەڵکەکە سوێندیان دەخوارد (بەرامبەر بە ئاغا خێرمان خێر، شەڕمان شەڕ). واتە ئەگەر بەهۆی ڕاپەڕینەکەوە خێرێکمان دەستگیر بوو بەیەکەوە دەیخۆین، خۆ ئەگەر شەڕیش بوو هەر ئەوها.



لەدێی (چەغەمیرە) سوێند لەماڵی خوالێخۆشبوو (مام سەعید شەریفە قیت) خورا.
مەلای ڕەش عەزیزی کوڕی کە تەمەنی (١٦) سازدە ساڵ بوو بۆ لای جوتیارە سوێند خۆرەکانی نارد: (لەیاد نەماوە داوا چ بوو.. نووسەر).
لەگەرمەی کۆبوونەوەکەدا بەژووری ماڵی ناوبراو کەوت. ژوورەکە سەرەی دەهات لەجوتیاران. پاش سەلاو هەرکە عەزیز زار دەکاتەوە پێش ئەوەی تێی بگەن خوالێخۆشبوو: (خاڵە موسا) تۆزێك توندە تەبیعاتو لەسەربوو، لەجیاتی سەلاو وەرگرتنەوە هەتا کۆڵەمست گرتی لەسەر دڵی دا. زۆر بەسەرخۆیدا شکاوەو بەدڵساردی گەڕاوەو بۆ باوکی دەگێڕتەوەو گوتی: (ڕۆڵە ناحەقیان مەگرە. لەبەرچاوان بوو چ زولمێکیان لێدەکرا. هەر کەسیش بووایە من بە جەواب دەهاتم تەنیا ئەو پیاوە حەرەجی لێناگیرێت). ئەمە هێوری کردەوە.



## ببەلامان

چەند جوامێرو ڕیش چەرمووی ئاوایی، دوو ڕۆژ دوای سوێندەکە چوونە لای مەلای ڕەش و گوتیان: (ئێمە شەست ماڵین، شەست عەلبە دەغڵت دەدەینێ ببە لامان).
مەلای ڕەش گوتی:
- من نە پیاوی تفەنگم، نە دارو بەرچیغ تا بەرەنگاری ئاغا ببم. بەڵام بەقسەی چاکەو خێر بۆ ئێوە زیاترم لەدەست نایەت و مەرجیش بێت لەم ڕووە قسووریتان بۆ نەکەم.
ئاغاش خەفیەی ناردبووە پشت ماڵیان و هەرچی گوترابوو لەمست ئاغای دەنێت: (دەشزاندرێت کێبوو. باری کۆمەڵایەتی ڕێگا نادات ناوی بخرێتە سەر کاغەزەوە... نووسەر). ئیتر ئاغا لەو ڕۆژەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ مەلای ڕەش ئاسایی نەبوو..و ویستی باربکات، بەڵام (قائیمقام)ی شارۆچکەی مەخموور گێڕایەوە.



# شكايەت

شكايەت كەوتە لای پارێزگاری هەولێر: (رەشید نەجیب)ی ناوبوو جوتیارەكان دەیانگوت: (ئاغا وێرای تاپۆی بیستی چوارو قاوەچیانەو شەقڵچیانەو كاورانەمان لێدەستێنێت، سوخرەی زۆرمان پێدەكات و جوێندانیش هەر هیچ. هەر رۆژێكیش نیازی بێت دەرمان دەكات، یان زەویمان لێدەستێنێتەوە).

ئاغاكانیش: (جوتیارەكان لێكرا لەدین وەرگەراون بوونەتە شیوعی).

هەركە حكومەتی بەغدا پێ حسیا: زۆربەی خەڵكی گوندەكانی دەشتی هەولێر راپەریون لەسەر پارێزگاری هەولێری كرد بەزووترین كات هۆی راپەرینەكەیان بۆ رەوانە بكات.

پارێزگار ئەوسا (موتەسەریف)یان پێدەگوت. ناچار بۆدەرخستنی حەقیقەتەكە، لەگەڵ چەند كەسانی پیاوچاك و دیندارو دنیا دیتەی نێو شاری هەولێر كۆدەبێتەوەو پێیدەڵێن:

– ئێمە دەزانین هێندە ئاغاوات زوڵمیان زۆرە، بەڵام ئەگەر بنج و بنەوانی راستیەكەت دەوێت بنێرە دوای مەلای رەشی چەغەمیرە. ئەو پیازێكی سپیكراوت لەمست دەنێت.

لەدوای مەلای رەشی ناردو هەركە واریقاتەكەی لێدەپرسێت دەڵێت:

– بۆ من نەهاتووە ناوی ئاغاو جوتیاران بهێنم. بەس من سەربردەیەكت بۆ دەگێرمەوە.

پارێزگار دەڵێت (فەرموو).

– گوڵە سەگێك بووە شوانی مێگەلە مەرێك. هەموو بەیانیان مێگەلەكەی بۆ لەوەر دەبردە نێو پاوان و ئێوارە دەیهێناوە. چەند وەخت بێ گیروگرفت وابەسەرچوو. تاكو رۆژێك دێڵە گورگێك خۆی دەگەیەنتە گەمبوڵەكەو حەزی دڵی دادەمركێنێت. ئەویش لە تۆڵەدا مەرێكی پێشكەش دەكات. بەم جۆرە دێڵە گورگەكە هەموو رۆژێ دەچوو خۆی لەبەر گوڵەكە دەناو مەرێكی بەنسیب دەكرا. ئەفەندم ئەوەی گوتم حەقیقەتەكەیە).

پارێزگار لەپاداشتا (١٢) دوازدە دیناری پێشکەش دەکات.

هەرکە ڕاستیەکەی بۆ. واژی بووەوە یەکسەر هۆی ڕاستەقینەی سەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکە بۆ بەغدا دەنێرێت. فەرمان بەزووترین کات دێتەوەو: (جوتیار نابێت لە بیستی دوو= (١٠٪) تاپۆ زیاتر بداتە ئاغاو سوخرە ناکەن و دەرکردن نییەو ئەگەر ئاغا جوێنی پێدان پێی بدەنەوە.

پارێزگار پۆلیسی نارد جوتیارە ڕاپەڕیوەکان ئاگادار بکاتو: (ڕاپەڕینەکەتان سەرکەوتنێکی مەزنی وەدەست هێناو ئاغا لەمەودوا حەدی نییە جێبەجێی نەکاتو لەئاستتاندا پێ خوار دابنێت).

حیزبی شیوعی تاوانێکی یەکجار گەورەی دەرحەق دەسکەوتەکە ئەنجامدا. وەنەبێت ئارامی بگرتبووایەو بزانێت باشە، یان خراپە، بۆ ئەوەی دوو ئەندامی لەنێو جوتیارە ڕاپەڕیوەکان زیاد ببێت کادیری بۆ دێهاتەکان نارد.

ڕۆژێك لەئاقاری گوندی شێخان یەك لەکادیرەکانی سەیارەی ئەو پۆلیسانە دەبینێت کە جوتیارەکانیان تەبلیغ دەکرد، لەترسانا ئەو بەیان و نەشرەی لادەبێت، لەبەر چاوی پۆلیسەکان فرێدەدات و بەسواری پاسیکل تێدەقێنێت. ئەوانیش هەڵیدەگرنەوە. ئیتر حکومەت بەهۆی نەشرەکانەوە جوتیارەکان بەدرۆزن لەقەڵەم دەدات و ئاغاکانیش ڕاستگۆ. بڕیار دەدات ڕاپەڕینەکە لەناوبەرێت.

حەسەن ئاغا بەم ڕادەربرینەی مەلای ڕەش زۆر قار دەخوات و دڵگیر دەبێت. بەڵام لەئاستیدا چی پێنەدەکرا. لەو ڕۆژەوە پشتی بەیەکجاری لە مەلای ناوبراو کرد.



# لەناوبردنی ڕاپەڕینەکە

لە هەر گوندێکی ڕاپەڕینەکەی تێدا ئەنجام درابوو، دە دوازدە جوتیاریان بەند کرد.

(لازار) قائیمقامی قەزای مەخموور، ئاسووری بوو چاوئێشانە دەگەڕاو هەڕەشەی لەجوتیارەکان دەکرد. کوردیشی باش نەدەزانی دەیگوت: (سەرقوت دەکەم. سەرپەل دەدەم). ئیتر ئەنجامی ڕاپەڕینەکە، لەسایەی تێکۆشانی حیزبی شیوعیەوە بەفیڕۆ چوو. بوو بە جەژنی ئاغان و خەم و کەسەری جوتیاران و ناچار بوون مل وەك جاران بۆ ئاغا کەچ بکەنەوە.

ئەم دوو وشەیە (گۆردە)و (چەورە) لەم ساڵەدا باویان ساند.

١- گۆردە مانا (گەوادی مل پان). دەقەبەڵ ئەو جوتیارانە کرا لەکاتی ڕاپەڕیندا لایەنگیری ئاغا بوون.

٢- چەورە: (شتێك بەخوایشتی خۆت بەجێ بێڵیت و ئەوجا حەوجەی ببیتەوە). بەو جوتیارانەی لەگەڵ ئاغا پێك هاتبوونەوە دەکوترا.

لازار وەك چاوئێشە دژی جوتیارەکان لەناوچەکە دەگەڕا. ناحەقیش نەبوو مانگێ بەلای کەمیەوە سێ چوار جار لەلایەن ئاغاکانەوە دەعوەت دەکرا.

بەس ئاغای گوندی چەغەمیرە چەندین جار دەعوەتی کرد. بۆ ئەوەی خەڵکەکە پێنەحەسێن ئێواران لۆکسیان لەسەر سەکۆی دیوەخان دادەنا و بە بەتانیەك قائیمقامیان پەنا دەدا. ئاغا بەمنداڵی خۆی سینی رازاوەی بەتکەی گۆشت بەرخ و ئارەق لەناو، بە پەڕۆیەکی سپی داپۆشراو پێشکەش دەکرد.

لەئاست قائمقامێکی ئاسووری ئەمە هەڵوێستی ئاغاکان بوو، کەچی لەئاست میللەتەکەی خۆیان کە لە باب و باپیرانەوە بەیەکەوە ژیابوون دەیانگوت: (کرمانج لێکرا کافر بوونەو بوونەتە شیوعی).



# بەند کردن

لەناوایی چەغەمیرە، بەفیتی ئاغا نزیکەی دوازدە کەسی دەستی باڵایان لە جموجۆڵی ڕاپەڕینەکە هەبوو، لەمەخموور گیران.

مەلای ڕەش زۆر پێ دڵتەنگو خەمبار دەبێت. بەدەیان جار لەسەر نان دەیگوت: (لەتاو گیراوەکان، نە نانم بۆ دەخورێت، نە خەویشم هەیە).

هەموو ڕۆژێ بەلای کەمیەوە، بۆ بەردانیان کەرەتێك، دووان یەخەی ئاغای دەگرت. (لەیاد نەماوە چەند گیران- نووسەر). لەکاتی پێکهاتنەوەی جوتیارە سوێندخۆرەکانی ناوچەکە، لەگەڵ ئاغا، بۆ ئەوەی سوێندەکەیان (تەڵاق) بوو، نەکەوێت گوتیان: (ئێمە تەنیا بە مەلای ڕەش ڕازینە وابکات سوێندەکەمان لێنەکەوێت) ئەویش دەلحاز بۆ بەیانی بەگوێرەی ئایینی ئیسلامی جێبەجێی کرد.

زۆر لە جوتیارە ڕاپەڕیوەکان باریان کرد. هێندێکیان چوونە دێی تر. زۆریشیان بەرەو شار چوون. هێندێکیش ئاغا دەری کردن. ئیتر ڕاپەڕینەکە بەتەواوی سارد بووەوە.

ئاغاکان لەو ڕۆژەوە هەڵیان بەستا: (هەر منداڵێکی لەدوای ساڵی (١٩٥٣)دا بووبێت بیژییە). کەچی ڕاستیان نەدەکرد. تەنیا بۆ ئیهانە هەڵیان بەستا. ئەگەرنا مەلای ڕەش گیروگرفتی تەڵاق خواردنەکەی بنبڕ کردبوو.



# سلێمان مەلۆك

خوالێخۆشبوو (سلێمان مەلۆك) پیاوێکی جەسوورو لێهاتوو بوو. وەزیری دەستەڕاستی ئاغابوو. لەساڵانی دابەش کردنی زەوی‌و زارو دیارکردنی سنووری دێهاتەکانی ناوچەکەدا دەستێکی باڵای هەبوو. خزمەتێکی یەکجار زۆری بە ئاغاو گوندی چەغەمیرە گەیاند. وێڕای ئەوەش ئاغا هەر کارێکی گران‌و زەحمەت مەیسەر بووایە، بە ئەوی ڕادەپەڕاند. خۆشەویسترین کەس بوو بەرامبەر بە ئاغا.

تا ئەویش لە زولم‌و زۆرداری‌و سوخرەو بێکاری ئاغاکەی بێزارو.. وەڕس بووبوو. لەساڵی (١٩٥١-١٩٥٢) بەخۆ..و پێنج براوە، بە پاڵپشتی ئاغای (....) لەگەڵ ئاغای گوندی ناکۆکیان هەبوو، بەرەنگاری ئاغا خۆشە ویستەکەی خۆی بووەوەو گوتی:

- ئەو زەوییانەی لەبەر دەستی خۆمو براکانم دانە مافی ئاغایان بەسەریانەوە نییە.

شەوان نۆبەتیان دەگرتو ئاغاو خزمەتکارەکانی تاسایان نەدەکرد تخوونی گەڕەکەکەیان، کە بەگەڕەکی (مەلۆکان) ناودەبردرا بکەون. بەڕۆژ ئەگەر یەکیان بچووبووایە جوت چەکی لەگەڵ خۆی دەبرد.



مەلای ڕەش بانگی سلێمانی کردو گوتی:

- پیاوی چاك بە وەرە لەگەڵ ئاغا پێکتان بهێنمەوە.

ئەویش گوتی:

- زولمی یەکجار زۆر لێکردیمەو ناتوانم لەگەڵی پێکبێمەوە.

- بۆ خوات پێدەڵێم: چیت پێ لەگەڵی ناکرێت.

- هەتا ئاو لەدوا بێڵم بێت چنگ قڕ دەکەمەوە. ئەگەر چیم بۆ نەکرا سەری خۆم لەقوڕ دەنێمو دەچمەکن نووری سەعید.

مەلای ڕەش بەسەر بادانی ناڕەزاییەوە گوتی:

- نووری سەعیدو ئاغای غەنیمو پاڵپشتەکەت یەك پێڕن. ئەگەر بۆت بکات، سبەینێ ئەم ئاغایەش دەست لەپشتی جوتیارانی ئەو دەدات.

هەر نەیسەلماندو، دواجار مەلای ڕەش پێیگوت:

- ئەو زەوییەی لەژێر دەستی جەنابت دایە، لە ئاغا مارەکراوەو هەتا ئەو حکومەتە بمینێت ئەو تەڵاقە ناکەوێت.

پاش ساڵو نیوێك کێشمەکێشو بەردەق بەردەق ئاغا ئەمری دەرکردنی سلێمانی هێناوەو نەیهێشت دەغڵی شینیش بدوورنەوە.



لەکۆبوونەوەیەکی ئیجازەی مەلایەتیدا، لە(....) دەدرا، خەڵکێکی یەکجار زۆر لەمزگەوتی (....) کۆبوونەوە. لەنێو ئەو عەشاماتەدا ئاغای پاڵپشتی سلێمان مەلۆك، بە پلارو تەوسەوە ڕووی لە مەلای ڕەش دەکاتو دەڵێت:

- مەلای ڕەش لۆ ئێستا سلێمانی مەلۆکی ناگێڕیتەوە؟.

پاش ئەوەی خانووبەرەشیان تێکدرا بوو، مەلای ڕەش یەکسەر لەپلارەکەی دەگات و دەڵێت:

- سوبحانەڵڵا لەو کرمانجانەی خۆمان، بۆ من نەهاتووە بڵێم: بێ ئاقڵن، بەڵام بۆ هێندە ساویلکەو خۆش باوەڕن!.

بۆ ئەوەی لەزاری بگات و:

- لە مەرامت ناگەم.

بێ پەردەو بەجورئەتەوە:

- باپیری لەگەڵ باپیرت حەفتا ساڵی رابردووە، باوکی لەگەڵ باوکت حەفتا ساڵ، بەخۆشی شەست ساڵ، لەماوەی ئەوەندە ساڵە قسەیەکی راستی لەئێوە بەرگوێ نەکەوتووە، نازانم چۆن بەدەست لەپشتداندا: (وەرە من بۆت دەکەم) هەڵفریوا.

ئەو قسەیە، لەبەردەم ئەو هەموو دۆست و دوژمنە زۆرەوە گۆترە نەبوو. ئاغاکە بەوپەڕی هەڵچوونەوە:

- مەلای ڕەش ئەوە قسە نەبوو کردت. مەرجە لەتۆڵەدا ناوچە بەدەرت بکەم.

- ناتوانێت تەماشاشم بکەیت.

- بەهۆی چ هێزێکتەوە؟.

بەدەست بردن بۆ مەندیل و ڕدێنییەوە:

- بەهۆی ئەو مەندیلەو ئەو ڕیشەوە. زۆر زۆر ئەگەر بۆ دیوەخانت هاتم، سەدەکەرێك بەپیرمەوە نەیەت دەڵێن: (بەخوا بابە فلان کەس پیاوێکی بێ ئاقڵەو بەپیر مەلای ڕەشەوە نەچوو).

خوالێخۆشبوو: (..........) پیاوێکی زاناو دین پەروەرو حەق خوازو بوو..و گوتی:

- بەحەقی خوا ئەگەر جەنابت لۆ دیوەخانی من بێت سەدەکەرێك بەسەری کۆت و پێخواسیەوە بەپیرتەوە دێم.

مەلای ڕەش ئەوسا ڕووی زاری لە بەرێوەبەری ناوچەکە دەکات و کە لە مەجلیسەکە دەبێت و دەڵێت:

– ئەگەر حکومەت باوکە میللەت منداڵێتی بۆ باوکێکی ئەوەندە بێ بەزەیی و کەم تەرخەمە منداڵەکانی هەموو تەفرو توناکران. ئەگەر حکومەت شوانەو میللەت مێگەلێتی بۆ شوانێکی ئەوەندە بێ ئاگاو خەم ساردە، گەلەگورگ مەڕەکانی کەل و علوم کردن. خۆ ئەگەر حکومەت: مێردەو میللەت ژنێتی بۆ مێردێکی ئەوەندە گەوادە ژنەکانی هەموو فەساد کران.

بەڕێوەبەری ناوچەکە، بەنا بەدڵی و ساردییەوە دەڵێت:

– مامۆستا قسەکانت زۆر راستو رەوانن، بەڵام ئەمڕۆ زرووفی باس کردنی نینە.



## خدر مەلا

خوالێخۆشبوو: (خدر مەلا) لەگەڕەکی مەلۆکان دەبێت. کچێکی بە منداڵی لەخوالێخۆشبوو (خاڵند)ی برای سلێمانی مەلۆك مارە دەکات. مام خدر لەکێشەکە دەبێتە لایەنگیری ئاغا.

ئەو شەوەی (بەهیە خان)ی کچی خۆی دەناسێت، بەفیتی ئاغا، بۆ ئەوەی زەربەیەك لە مەلۆکییەکان بدات، بەیانی لەشوێنی خۆی هەڵناستێتو تا دوو سێ ژنی ئەملاو ئەولایماڵیان دێنە لای و ئەوسا دەڵێت: (ئەنگۆ بەشایەت بن ئەوا من تەڵاقی خۆم لە خاڵند مەلۆکی بەتاڵ کردەوە).

خوالێخۆشبوو (حەسەن ئاغا) یەکسەر واریقاتەکەی لە مەلای رەش دەگەیەنێت.

ئەویش دەڵێت: (زۆرم رك لەوە دەبێتەوە کچ بە منداڵی مارە بکرێت، کاتی خۆی، باوکی کوڕەو کچە سێ کەرەت خۆیان هاوێشتە ماڵم ئەوجا مارەم کرد. ئێستاش بەگوێرەی ئەو دینەی دەیپەرستم تەقەڵاکە ناکەوێت.

ئاغا دەچێتە لای مەلایەکی ترو ئەمری کەوتنی تەقەڵاکەی بۆ مەلای رەش دەهێنێت.

– ئاغا من مارەم کردووە، نەك فلان مەلا.

ئاغا زۆر تووڕە دەبێت و دەڵێت: (وەرە مەلای جێیان دەیەخێت کەچی مەلای خۆمان نایەڵێت).

- کوڕ باوکم دینی خۆم بۆ ڕەزامەندی جەنابت ناچوێنم.

ئاغا بۆ یەکلا بوونەوە مەلای ڕەش لەگەڵ مەلای باس کرا، (ناوهێنانی هەموار نییە) بەیەك دەگەیەنێت.

مەلاکە دەیەوێت ئەو کتێبە شەرعیەی بابەتەکەی تێدایە نیشانی بدات، مەلای ڕەش یەکسەر دەڵێت:

- تۆ کتێب بە من نیشان مەدە. ئەگەر ئەو کتێبە ڕەش بووەوە من سەر لە نوێ بۆتی دەنووسمەوە: (دەلیلەکەتم پێ بڵێ، کە تەڵاقەکە نەهاتووە).

- باوکی کچە فاسقەو ناتوانێت کچی خۆی مارە بکات.

- بەچیدەزانیت: فاسقە؟.

- نوێژی چوواندووەو ڕۆژی نەگرتووەو حەرامی خواردووەو ڕەشبەڵەکی کردووە.

- ئەگەر پیاو بە ئەوانەی دەڵێیت ببێتە فاسق ئێمەی کورد هیچمان ناتوانین کچی خۆمان مارە بکەین. فاسق لەشەرعی ئیسلامدا ئەو کەسەیە، لە کۆڕو مەجلیسان، بە پارە هەڵپەڕێت و سەما بکات. ئەو تەرحە کەسە بەدینی ئیسلام، لە باوکاتی دەکەوێت و کچی خۆی پێ مارە ناکرێت.

ئاغا کە لەلایەن مەلای ڕەشەوە بە مەرام نەگەیشت ویستی بەڕێگەی عورفییەوە تەڵاقەکە بیەخێت.

خوالێخۆشبوو (ڕەشید ئاغای گوندی کۆزەپانکە) لەلای بەڕێوەبەری ناحیەی دیبەگە دانیشتبوو حەسەن ئاغا عەریزەیەکی، بۆ مەسەلەی تەڵاقەکە دا بەڕێوەبەر، پێیگوت:

- من بکە بە شاهید.

ئەویش ناوی بە شاهید نووسی.

ڕۆژێك بەڕێوەبەر بە ڕەشید ئاغا دەڵێت:

- کوو لەو تەڵاقەی دەگەیت؟.

- تۆ ژنت هەیە؟.
- بەڵێ دوو منداڵیشم هەیە.

ڕاستو ڕاست پێیدەڵێت: (تۆ تەڵاقت نییە).

بەحەیرمانەوە (بۆ لەبەرچی!؟).

ئەوەی دەڵێیت: مەلای ڕەش مارەی کردووە هێز نییە بییەخێت.

ئیتر عەریزەکە ڕەفزکراوە[1].



# ئەو پیاوانەی پەیوەندیان لەگەڵ مەلای ڕەش هەبوو

## مام تەها سەفەر

هەرکە مەلای ڕەش لەشارۆچکەی مەخموور دەبێتە مەلا پەیوەندی لەگەڵ پیاو ماقوولو ناوداری شارۆچکەکە پەیدا دەکات، تایبەت لەگەڵ خوالێخۆشبوو (مام تەها سەفەر).

خێزانەکەی ناوبراو: پلکە (عیسمەت) خزماتی لەگەڵ مەلا ژن دەبێت. ئەو پەیوەندییە بەردەوام دەبێت. دوای بارکردنی مەلای ڕەش بۆ چەغەمیرە هەردوو بنەماڵە ئامەشۆیان گەرمو گوڕ دەبێت. مەلاژن تایبەت سەردانی پلکە عیسمەتی دەکردو ئەمیش هۆیدەداوە.

زۆر جار کوڕەکانی مەلای ڕەش بە ئیش دەچوونە مەخموور گوێدرێژیان لەماڵی مام تەها دەبەستاوەو نیوەڕۆش نانیان لەماڵی دەخواردو نۆبات شەوان دەمانەوە.

---

1- لەبەر ئەوە ئەو بنەماڵە خزمەتی ئێمەیان بە یەکجار زۆر کردووە، نەخەسەلە ئاغاژنە (فاتم) بۆیە ئەو نووسینەی من دەچێتە ژێر پەردەی ناهەمواریەوە. بەڵام مێژووی ڕاستەقینەی گوندەکەیەو پشزاندرێت کە مەلای ڕەش سەری بێدینی بۆ کاربەدەستان دانەهێناوە، بۆیە ناتوانم درۆی لەگەڵ بکەم. داوای لێبوردن لە بنەماڵەی خوالێخۆشبوو: حەسەن ئاغا دەکەم... نووسەر.

هەرکە قەسران لەتەك مەخموور دروست کرا، مام تەها بێستانی بەراوی دەچاند. ساڵی دوو کەڕەت جوابی بۆ ماڵی مەلا دەنارد: (بێن شفتی و گندۆرە ببەن).

هەر جارێ تێرکەیەکیان پڕ دەدایە. گەرچی شفتی و گندۆرەی مەخموور گچکە بوون، بەڵام زۆر بەتام بوون و شیلەیان بەدەست وە دەنووسا.

ئەو پەیوەندییە بەهێزە، تاکو مەلای ڕەش بۆ دێی مورتکەی گواستەوەو لەیەکتر دوورکەوتنەوە، بەئاستەمیش سارد نەبووەوە.



## حاجی موحەمەد نەجاڕ

مەلای ڕەش لە ئاخرو ئۆخرەی بیستەکان و سەرەتای سییەکانی سەدەی رابردوو دەچێتە گوندی (دێمەکار)ی شێخ موحەمەد پاشا.

خوالێخۆشبوو حاجی موحەمەد نەجاڕ پیاوێکی بەدین و ڕاستگۆو دیمەن جوان، دارتاشێکی دەست ڕەنگین. لەسەرتاسەری ناوچەکە بێ هاوتا دەبێت، دۆستایەتی لەگەڵ مەلای ڕەش پەیدا دەکات. هەر ئەو ساڵە کتێبخانەیەکی نەخشین و قەشەنگ و مکووم و درێـژی مەترو شەست سەنتیمەترو بەرینیش شەست سەنتیمەترو دوو دەرگەو سێ جێگەی کتێب لەناوەوە بۆ دروست دەکات. هەشتا ساڵەو ئێستاش کتێبخانەکە ماوەو توندو تۆڵە.

مەلای ڕەش دەچێتە گوندی (چەغەمیرە)و حاجی موحەمەدیش دەچێتە گوندی (عاللا). نێوانیان بەپێیان سێ چوارێکە سەعاتە دۆستایەتی ئەو دوو ماڵە بەردەوام دەبێت. ناوە ناوە منداڵەکانیان جگە لەبۆنەی شایی و تازییەدا ئامەشۆی یەکتریان دەکرد. مەلای ڕەش مەگەر بەدەگمەن دەنا لەبەر دەرس گوتنەوە سەفەری نەدەکرد. ماوەی بیست ساڵ حاجی موحەمەد دەچوە ماڵیان و مەلای ڕەشیش ناوە ناوە خەبەری بۆ دەنارد: (بڵێن بەو دارتاشە ڕۆژێك دێم دەیتاشم).

مـاڵی حـاجی موحەمـەد نـەجار بـار دەکـات و دەچـێتە شـاری کـەرکووک و مـەلای ڕەشیش دەچێتە گونـدی (مورتکـە)ی عـەلی ئاغـا. ئامەشـۆیان هـەر تێک نەچـوو بـوو. هەرکـە مـەلای ڕەش وەفـات دەکـات حـاجی موحەمـەد لەگـەڵ چـەند مـەلا ناودارەکـانی شاری کەرکووک چووە تازییەیان کەچی ئاموشۆکە دوای ڕاپەڕین بڕا.



## کێخوا مەحموود

چاکەی خوالێخۆشبوو کێخوا مەحموودی خدری گوندی قەڵاتە سۆرانی بامەنـدان، دەرحەق بنەماڵەی مەلای ڕەش هەتا تەپڵی قیامەت لەیاد ناکرێت.

مەلای ڕەش ساڵانە بۆ سپیاتی هەشت نۆ سەرمەڕو بزنیان ڕادەگرت. تاکو منداڵـە نێرینـەکان پێینەگەیـشتبوون ئـەو ڕۆژەی شیروشـک دەبـوو ئـەو پیـاوە منـداڵی خـۆی لەقەڵاتـە سـۆران ڕا، کـە نزیکـەی چـوار پێـنج سەعاتە ڕێیـە بـەپێیان ڕەوان دەکـردو ئاژەڵـەکان مـاڵی مالایـان دەبـردو هـەتا وەرزی بـەهار، بـەکاو جـۆی خۆیـان بـەخێو دەکـردن. گریمـان کارێـک، یـان بـەرخێك بمردبووایـە، کـارو بـەرخی خـۆی دەخـستە بەربزن و مەڕە بێچووە مردووەکە. ئەوجا بە منداڵی خۆی ڕەوانی دەکردنەوە.

هەرکە موحەمـەد ئـەمینی کوڕی مـەلا پێـدەگات دەیـبردن و دەیهێنانـەوە. پاش ئـەو عەزیزی کوڕی پێ هەڵدەستا.

یەکەم جار موحەمەدئەمین گچکە دەبێت و دەترسێت و دەڵێت: (ڕێگر حەیوانـەکانم لەناو زورگ لێناستێنن؟).

خوالێخۆشـبوو (حوسـێن)ی کـوڕی کوێخـا مـەحموود دەڵێـت: (ئەگـەر ڕێگـرت تووشبوو بڵێ: جوتیاری حوسێنی مەحموودی خدریمە لێتناستێنن).

جاری یەکـەم عـەزیز لەگـەڵ بارگـەو بنەگـەی گوندەکـەیان بۆ قـەراج دەچـوون چـوو. لەنزیك گوندی (بیرمهێدی) لێیان دابڕاو ڕێگاکەیان پێ نیشاندا.

باران دەستی پێکرد. ئەو ڕۆژە خەڵکی قەراج زۆر بەپەرۆشی باران بوون. هەرکە گەیشتە ئاوایی لەشی سەرتاپا تەربوو. چەند زەلامێك سەریان لەدەرگەی دیوەخان دەرهێناو خوالێخۆشبوو (مام مەعجوم)، برا گچکەی کوێخا مەحموود عەزیزی ناسیو گوتی: (کوڕە ئەوە مەلای سپییە[1] و پێ‌و قدوومی خێرو بەرەکەتە) هاتە دەرەوەو باوەشی لێداو لەسواری گوێدرێژ هێنایە خوارەوە. (ئەو پیاوە مەزنەو پایەبەرزە (مام کوێخا مەحموود) نزیکەی بیستو دوو ساڵ لەسەر یەك بەم چەشنە ختوخۆڕا، تەنیا لەپێناوی خوا خزمەتی ئێمەی کردووە. ئەگەر سەت هێندەی دی لەسەر ئەو کەلەپیاوە بنووسم بڕوا بکەن تۆزی چاکەی هەرگیزاو هەرگیز ناشکێنێت. کەچی بەداخەوە لەئاستیدا من هەر ئەوەندە نووسینە کەمەو بێ بەهایەم لەدەست دێتو بەس... نووسەر).



## سەید خدری حەسەن بلباس

خوالێخۆشبوو مام سەید (خدر)ی گوندی حەسەن بلباس کەوتووەتە بناری باکووری خۆرهەڵاتی چیای قەرەچوغ لەسەیدەکانی (پیرخدر) بوو. پیاوێکی زۆر باشو ناندەرو بەدینو پیرۆز بوو.

خەڵکی ناوچەی قەراجو کەندێناوە باوەڕیان زۆر پێ بوو، ماڵی هەردەم لە زیارەتکەرو نەخۆش مۆنجەی دەهات. دووعاو نوشتەی بەلاش بۆ نەخۆشو شێتو دەرداران دەکرد. بەقسەی عەوامی سەردەم شێتو هار لەماڵی چاك دەبوونەوە. لەگەڵ ماڵی مەلای ڕەش دۆستایەتیەکی زۆر بەتینی هەبوو. مام سەید ناوە ناوە سەردانی

1- مەلای سپی:- ڕۆژێك چوار پێنج مەلای میوانی مەلای ڕەش دەبن. عەزیزی کوڕی مەلا، لەتەمەنی پێنج شەش ساڵان دەبێت مەندیلێکی سپی لەسەر دەنێتو دەچێتە لای مەلایەکان دادەنیشێتو دەڵێت: (بابم مەلای ڕەشە، ئەمنیش مەلای سپیمە). لەو ڕۆژەوە، لەلایەن زۆر کەسان. بەتایبەتی مەلایان بە مەلای سپی ناودەبردرا.

مەلای ڕەشی دەکرد. باوەڕی زۆر بە مەلایەتیەکەی هەبوو. کەچی مەلای ناوبراو لەبەر دەرس گوتنەوە نەدەچووە هیچ شوێنێك. خەڵکەکەش کەمو زۆر حەرەجیان لێنەدەگرت.

منداڵی ئەو دوو بنەماڵە ناوە ناوە دیدەنی یەکتریان دەکرد. ڕێزێکی تایبەت لەمیواندارێتی مەلاژن دەگیرا.

عەزیزی کوڕی مەلا لەگەڵ خوالێخۆشبوو (سەید کەریم)ی کوڕی بەیەکەوە فەقێ بوونە. هەم لەگەڵ خوالێخۆشبوو (سەید ئیبراهیم)ی براگەورەی سەید کەریم دۆستایەتیان زۆر بەهێز بووە.



## مام قادر

خوالێخۆشبوو (مام قادر)ی برای (مام ڕەجەب)ی ئاوایی چەغەمیرە، پیاوێکی زۆر باشو بەدینو کەم دوو..و بێ زەڕ بوو. لەعەمری خۆی کێشکەی لەئاو نەکرد بوو.

دۆستایەتییەکی بەهێزی لەگەڵ ماڵی مەلای ڕەش دەبێت. هەردەم بەکاروباری ماڵی مەلا هەڵدەستا. لەبەر خۆشەویستی منداڵی مەلا ناویان نابوو (مام قادرۆکە).

کچێكو دوو کوڕی دەبێت. خێزانەکەی وەفات دەکاتو کیژەکەشی دا (مەلا ئەبووبەکری برازای لەگوندی بێستانە).

مەلای ناوبراو بۆ ئەوەی ماڵی مامی بێ کابانو بنەوان نەمینێتەوە، کچێکی (۱۱) یازدە ساڵان پێشکەش بە سەدیقی کوڕە گەورەکەی دەکات. کیژە لەبەر منداڵی فێرە نان کردنو شیولێنانلن نەبووبوو.

نێوان ماڵی مەلای ڕەشو ئەوان کەندێکی زۆر قوڵ بوو..و تەواوێکیش دوور، خێزانی مەلای لەبەر خۆشەویستیو پیاوباشی مام قادر هەموو ڕۆژێ دەچووە ماڵیان هەتا بووکەکەیان فێرە نان کردنو چێشت لێنان بکات، بۆ ماوەی دوو ساڵی ڕەبەق

مەلاژن ڕۆژ بێری نەدەکرد. تاکو بووکەکەی باش فێرە نان کردن و شیولێنان و گڕو.. وژی دیکەی سەردەم کرد. ئێستاش ژنەو پیاوە لەژیاندا ماون و واریقاتەکە دەگێڕنەوەو (حاجی سەدیق و بەهیەخان)ن.

هەرکە ماڵی مەلای ڕەش لەچەغەمیرە باری کرد چەند سەرمەڕو بزنیان هەبوو بە مام قادریان سپارد. پاش هەفتەیەك بە پێیان بۆیانی بردە گوندی مورتکە.



## حاجی عەولای نەبیاوە

خوالێخۆشبوو حاجی عەولای نەبیاوە پیاوێکی ناودارو چاوتێرو بەخشندەو خاوەن دیوەخان بوو. دایکی لەگەڵ خێزانی مەلای ڕەش ئامۆزا بوون. بۆیە ئاموشۆی نێوانیان گەرم و گوڕ بووە. حاجی عەولا برایەکی وەفات دەکات. مەلای ڕەش لەئاوایی چەغەمیرەوە، بەخۆ..و کۆمەڵە فەقێوە دەچیتە تازییەکە.

حاجی ناوبراو لەبەر خاترو ڕێزگرتنی مەلای ڕەش لەدوای مەلای گوندەکانی دەوروبەر دەنێرێت.

ئێوارە مەلای ڕەش دەسنوێژ دەشوات و دێتەوە دیوەخان. هەرکە پێی تەڕی لەسەر لبادی دیوەخان دادەنێت، مەلایەکان لێکڕا دەڵێن: (مامۆستا پیت پیس بوو).

ئەویش لەگەڵ پێ بە لباد داهێناندا دەڵێت:

– ئەو لبادە چی پێوەیە، گووی پێوەیە، ڕیخی پێوە تاکو پیس ببێت. نازانم ئێوەی مەلا ئەو دینە سوکەی بۆ واقوڕس دەکەن.

مەلاکان کەم و زۆر نقەیان لەبەر وەنەهات.



# بارکردن لەچەغەمیرە

پێش پەیدا بوونی تەرەکتەرو دەڕاسە، نێوان ئاغاو کرمانج لە ئەوپەڕی باری ڕێزو خۆشەویستیدا بوو. گوزەرانی جوتیاران هیچ جۆرە گرفتێکی ئەوتۆی نەبوو باس بکرێت، بەهەموو توانایانەوە یارمەتی مەلایاندەدا.

هەرکە تەرەکتەرو دەڕاسە پەیدا بوون ئاغا پێویستی بە جوتیاران نەماو تەماع گیربوو. ناو بەناو زەویی لەجوتیاران دەستاندەوە.

بۆچوونەکەی (مستەر لاین)ی ئەندازیاری دابەش کردنی زەویی کشتوکاڵی ساڵی (١٩٣٧-١٩٣٨)دا: (زەوی مەدەنە ئاغا، دواڕۆژ بەخۆی دەرتان نەکات، کوڕی، کوڕێ کوڕی دەرتان دەکات.

جوتیارەکان گوتیان:

- ئاغا ناتوانی ئەو هەموو زەوییە بەتەنیا بەکار بێنێت، پێویستی هەردەم بە ئێمە دەبێت.

- تا ئەو ڕۆژەی من دەڵێم: مەکینەیەك پەیدا دەبێت جوت بکاتو بشدوورتەوە.

- ئۆی... لەو درۆیە!).

جوتیاریش خێزانی ساڵ بەساڵ پتر دەبوو. بۆ بەڕێوەچوونی ژیانیان پێویستیان بەزەوی زۆرتر دەبوو، کەچی ئاغا لێیدەستاندنەوە، تا وای لێهات جوتیار لە هێندە ئاوایی ئاغانشیندا لەنیوەی زەویی پێشتری کەمتر لەبەردەست ماوەو نەمریو نەژی دەیگوزەراند.

ماڵە مەلاش ئەوسا بە بەرهەمی جوتیاران بەڕێوە دەچوو.

جوتیاریش بۆ خۆی نەبوو بیخوات بۆ مەلا لەکوێ بێنێت، گوزەرانی مەلاش بەجارێ دابەزی.

(من زۆرم لەگەڵ باوکم هەوڵدا بار بکات نەیدەسەلماندو دەیگوت:

- منداڵەکانم لێرە ڕاهاتوونەو نانە جۆی ئێرە بە پلاو برنجی جێیان نادەم.

(لەکۆڵی نەبوومەوە هەرکە پێم سەلماند خوالێخۆشبوو (ئاسیاخان)ی کچی ئاغا زانی و هات پێڵاوەکانی باوکمی ماچ کرد. ئیتر پەشیمان بووەوە.. نووسەر).



# عاجز بوون

مەلای رەش چاوی ئاوی سپی بوو..و پێویستی بە عەمەلیات هەبوو. (عەبدولقادر جوادی)ی دکتۆری چاو بوو لەشاری موسڵ و دکتۆرێکی ئینگلیزیش هاتبووە شاری سلێمانی.

لەسەر چارەی چاوی لە خوالێخۆشبوو (حەسەنی کوڕی ئاغا) عاجز بوو ڕووی لە عەزیزی کوڕی کردو گوتی:

– (کەلکی ئێرەم نەماو بۆ هەر کوێیەکم دەبەیت ڕازیم. بەس بەدزی بێت. ئەگەرنا پیاوێکی وەك شێخ عەبدولکەریمی دارەخورماییم بەگژ وەدەنێن).

وابوو بەهۆی ئەو خوالێخۆشبووانە: (مامۆستا مەلا سەلیم و حەسەن ئاغای دیبەگە) جێیان لەگوندی مورتکەی گەورە بۆ گرت.

عەزیزی کوڕی پێشتر چووە دێی ناوبراو بە خوالێخۆشبوو (عەلی ئاغا)ی راگەیاند:

– (باوکم دوو شتی لە تۆ گەرەکە:

– یەکەم: من حەقم بەسەر فەلاحی ئاواییدا نییە، منداڵم ڕووت و برسی بن یەخەی جەنابت دەگرم.

دووەم: من لەو مەلایانە نیمە هەر تازییەك و موناسەبەتێك هەبێت من لەگەڵی بچم).

عەلی ئاغا بەوپەڕی خولق خۆشییەوە فەرمووی: (لەیەکەمیان من تاکە کەسم بەرپرسی گوزەرانی. لەدووەمیشدا ئەو مەلایەو لەو شتانە فەرموویەتی ناوەشێتەوە.. نووسەر).



بۆ ئەوەی بارکردنەکە سەربگرێت ئێوارەیەك دوای شرەکە بوونی ئاسۆ عەزیزی کوڕی ئۆتۆمبێلێکی لەشارۆچکەی (دیبەگە) گرتو باوکی بەناوی کۆبوونەوەی مەلایان لەدیبەگە بردە شاری هەولێرو لەماڵی مەلا نیعمەتی زاوایانی حەشاردا.

ئیتر ماڵەکەیان لەمانگی ئەیلوولی ساڵی (١٩٥٦)دا گواستەوە. لەپێشدا لۆرییەك هاتو ئەو خوالێخۆشبووانە تێدا بوو: (عەلی مام عەزیزو مام تەهاو عومەری پلکە عەیشێ). ماڵەکەیان برد.

پاش دوو سەعات ڕۆیشتنی لۆرییەکە قەمەرەی (عوسمان خدر خانچی) بەدوای منداڵەکانەوە هات.

ئەوسا چەند کەس لەخەڵکی ئاوایی لەحەژمەتی بارکردنەکەی مەلای ڕەش لەبراڕۆیاندا. بەتایبەتی خوالێخۆشبوو پلکە (ستی)ی خێزانی خوالێخۆشبوو (مام حوسێن حەوێز) بەدەنگێکی زۆر زۆر بەرزەوە گوتی:

- وەیڕۆ.. براڕۆ..و وەیڕۆ.. کاکەڕۆ!).



# عەلی ئاغا

هەرکە ماڵمان چووە دێی (مورتکە)ی گەورە تەمەنم (٢٠) بیست ساڵ بوو. ئێستا (٧٤) حەفتاو چوار ساڵە، ئەمدیوەو ئەم بیستووە، بەماوەی ئەوەندە ساڵەی ژیانم بەقەت خوالێخۆشبوو (عەلی مەحموود کاکەخان) ڕۆشنبیرو سەخی تەبیعاتو پیاوانە. بۆ درۆ..و ڕاستی فەرموون سەیری ئەمانە بکەن:

یەکەم: لەساڵی یەکەمدا کە ماڵمان چوو (١٩) نۆزدە عەلبە گەنمو دوو عەلبە جۆی دائێمە.

نزیکەی (١٠) دە ساڵیش دەبوو ئێمە لەگوندەکەی پێشوو ئەوەندە دەغڵەمان نەدەهات.

دووەم: هەموو مانگ دوو جار فەقێکانی دەعوەت دەکردن. باوکم ناوە ناوە تەعلیقێکی لێدەداو ئەویش زۆر پێ خۆشحاڵ دەبوو.

جارێك لەسەر دەعوەتدا باوکم گۆشتێکی لەدەستدا بوو..و گوتی:

– عەلی ئاغا لاموایە ئەم گۆشتە کڕاندرایتەوە.

(کڕانەوەش حاشا بۆ سەك دەگوترێت).

لەحریتەیداو گوتی:

– مامۆستا بە حەقی خودا ئەمن نەم کڕاندیتەوە.

سێیەم: هیچ مەلایەك لە گفتوگۆدا دەرحەقی نەدەهات، کەچی لەئاست باوکم چی بۆ نەدەکرا. تاکو جارێك پێیگوت:

– مامۆستا ئەگەر قەواعیدم بزانی بووایە ئەوکات دەمتوانی بە هەموو شێوەیەك موناقەشەت لەگەڵ بکەم.

ئەویش گوتی:

– ئەوکات جەنابیشت یەك دەبوویت وەك حەمەمینی کوڕم هەر ئەوەندەت بۆ دەکرا سەری (بەڵێ)ت راتەکێنیت و بەس.

چوارەم: لەتازییەی باوکم نزیکەی حەوت ڕۆژ میوانمان هات. بەتایبەتی مەلاو پیاوە ناودارەکانی شاری هەولێرو دەوروبەرو شاری کەرکوك. مەسرەف گشت لەسەر عەلی ئاغا بوو. لەدواییدا باس دەکرێت.

پێنجەم: لەمانگی ڕەمەزاندا عەلی ئاغا، باوکم و سێ چوار ریش سپی و جوامێری ئاوایی و من و کاکمی دەعوەتی فتاری دەکردن. پاشیوانیش باوکم و من و کاکم باشترین خواردنی سەردەمی ئامادە دەکرد.

ئێوارەیەك کاتی فتارکردنەوە، بۆ ئەوەی باوکم بجەڕبێنێت و گوتی:

– مامۆستا نانی ئێمەت پێ باشترە، یان ماڵی بایزی؟.

یەکسەر گوتی:

– عەلی ئاغا ئەگەر بە پلاوو گۆشت و کەباب و عێرم قازی و پاقلاوەتدا هەڵ بڵێم تۆ منت کردووەتە دابەستوو.

- مامۆستا من ڕاستییەکەم پێخۆشە.

- ئەوەی ڕاستی بێت، نانە جۆکەی ماڵی بایز بەو هەموو پڵاوو گۆشتو خواردنەی ئێوە نادەم.

بە ئەنقەست ڕووی گرژ نواندو گوتی:

- لۆ.. من چ عەیبم هەیە؟.

- ناڵێم تۆ عەیبت هەیە، بەڵام سی ساڵە ماڵی بایز خزمەتیان کردوومە، خوا قەبوڵ ناکات سی ڕۆژە هاتوومە لای جەنابت، نانی جەنابتم، لە نانی ئەوان پێ باشتر بێت.

ڕووی گەش هەڵگەڕاو بەدزی بە منی گوت:

- (ئەوە بچێتە لای ئاغایەکی تر زەمی من ناکات).

شەشەم: دوای نەمانی باوکم، واتە پایزی ساڵی (١٩٥٧)دا عەلی ئاغا زەوی‌و زاری خۆی هەموو تۆ کردو لەیادی نەبوو شکارتە بۆ ئێمە بکات من پێمگوت:

- ئاغا جەنابت ئەوساڵ تۆت بۆ ئێمە نەکرد؟.

یەکسەر گوتی:

- خۆ ڕاست دەکەیت!.

هەر ئەو سات بە خوالێخۆشبوو (قادر خاڵانی)ی جوامێرێکی بەدینی ئاوایی بوو گوت:

- هەر ئێستا لەگەڵ مەلا عەزیز بڕۆ جێگەی یەك عەلبە گەنم لەزەوییەکە تۆ کراوەکەی من بۆ ماڵی مامۆستا دابڕە.

من‌و مام قادر چووین، بەگوێرەی عەقڵ جێگەی یەك عەلبە گەنمان لەزەوی تۆکراوەکەی دابڕی‌و بەقوچەك‌و بەرد دیارمان کرد.. نووسەر.



# هەڵوێست

هەرکە مەلای ڕەشماڵی چووە گوندی مورتکەی گەورە خوالێخۆشبوو (عەلی مەحموود کاکەخان) هەر مەدحی (شێخ مەحموود)ی دەکرد. ئەویش بەڕووی هەڵشاخاو گوتی:

– عەلی ئاغا تۆ مەدحی کێم بۆ دەکەیت!. من منداڵی ناوچەکەمە: هەر قورە کوێخایەکی ناوچەکەمان، هەرکە دەهاتە سەرەمەرگا دەیوت:

– (سۆیەکی گەورەم لەسەر دڵ هاتووەو عزرائیل نەبێت چارەی ناکات. ئەویش پێیدەڵێن: شێخ مەحموود).

هەر کەسێك پارچە زەوییەکی هەبووایە، بەپارەیەکی کەم، یان بەداواو هەڕەشە لێیدەستان. هەر جوتیارێك مەرامی بەجێ نەهێنا بووایە، شەو پیاوانی خۆی دەنارده سەری و بەقوربانی گوللەیەکی دەکرد.



# صاحب القمصين

خوالێخۆشبوو (مام عەبود) جوامێرێکی زاناو ڕۆشنبیرو دینداری عەشیرەتی (کەشمولە)ی شاری موسڵ و خەزووری عەلی مەحموود کاکەخان بوو. ڕۆژێك لەدیوەخانی عەلی ئاغا، لەگەڵ مەلای ڕەش و چەند جوامێری ئاوایی دانیشتبوون. مام عەبود گوتی:

– پێغەمبەر فەرموویەتی (صاحب القميصين لايدخل الجنة) بەم شێوەیە ڕاڤەی کرد: (صاحب الزوجين لايدخل الجنة- واتە خاوەن دوو ژن ناچێتە بەهەشت).

مەلای ڕەش یەکسەر بە جواب هات و گوتی:

– ئەم فەرموودەیە ماناکەی وانییە.

– ئەدی؟.

- (صاحب القميصين= صاحب الوجهين) واتە خاوەن دووڕووو ناچێتە بەهەشت، نەك خاوەن دوو ژن.

عەلی ئاغا زۆری هەوەست پێهات‌و ڕووی لەخەزووری کردو گوتی:

- ئێوەی عەرەب هەرچەند عالمی دین بن بەقەت ئێمەی کورد لەدین ناگەن.



# پرسیار کردن لە عەلی ئاغا

حاجی حوسێن مەیاس، یەك لەپیاوە ناودارەکانی گوندی مورتکە بوو. گەرچی نەخوێندەوار بوو، بەڵام گەلێك ڕۆشنبیرو هوشیار بوو. بەتایبەتی لەمێژوو دەستێکی باڵای هەبوو، گێڕاوەو گوتی:

(من‌و عەلی ئاغا لەسەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا چووینە تازییەکی ماڵی بایزی (بەرەبابێکە لە ئاغاواتی دزەیی- نووسەر). مەلای ڕەش لەوێ بوو. بۆ ئەوەی عەلی ئاغای بجەڕبێنیت. هەستی نیشتمانی چۆنەو گوتی:

- عەلی ئاغا جەنابت نیزامی ڕۆژئاوات پێ باشترە، یان ڕۆژهەلات؟.

ئەوسا بەهۆی پروپاگەندەی حیزبی شیوعی‌و حیزبە نیشتمان پەروەرەکانی سەردەم یەکەمیان بە ئیستیعمارو داگیرکەر دەخەملێندراو دووەمیش بە نیشتمان پەروەر.

عەلی ئاغا حەیر دەمینێت: (ئەگەر دەڵێم ڕۆژئاوا ئابڕووم دەچێت، خۆ ئەگەر بڵێم ڕۆژهەلات ناودەنگم لەلایەن حکومەتەوە پیسەو ڕەنگە بەخراپ بەسەرمدا بشکێتەوە). چونکە لەشەڕی شێخ مەحمود بەشداری کردبوو کەچی ناچار نەشیش بسووتێت، نە کەباب بەم تەرزە وەڵامی دەداتەوە:

- مامۆستا ئەمن نازانم بەڵام بەڵگەیەکم لەدەستە دەبێ ڕۆژهەلات باشتر بێت.

- چۆن؟.

– سێن هەردەم هەراو هۆریاو شەڕو شۆڕو ئاژاوەی تێدابوو، تا ئەو نیزامەی تێنەکەوت بنبڕ نەبوو.

– ئافەرین وەڵامێکی زیرەکانەت داوە.



# حاجی قادر خاڵانی

خوالێخۆشبوو مام حاجی قادر خاڵانی پیاوێکی زۆر بەدینی گوندی (مورتکە) بوو. پێنج فەرزە، بەزستان و هاوین نوێژی لەدوای مەلای دەکرد. ماڵیشی لەمزگەوت زۆر دوور بوو. ئەگەر چلەی زستان بەفرو بورانیش بووایە جەماعەتی خۆی نەدەچوواند. هەموو ڕۆژێش، پاش نوێژی عەسر دەچووە سەر گۆڕستانی ئاوایی و فاتیحای بۆ مردووان دەخوێند.

مەلای ڕەش چاوی ئاوی سپی بوو..و باشی نەدەدیت مام حاجی هەر جارێ، لەکاتی دەسنوێژ شۆڕێندا بەمەسینە ئاوی بەدەست دادەکرد. هەرکە دەگەیشتە پێ شوشتندا مەلای ڕەش مەسینەکەی لێوەردەگرت و نەیدەهێشت ئاوی بە پێیدا بکات.



# حاجی موحەمەد

خوالێخۆشبوو حاجی موحەمەدی مام ڕەسول جوامێرێکی ئاوایی مورتکەی گەورە بوو. گەرچی نەخوێندەوار بوو، بەڵام مرۆیەکی زاناو تێگەیشتوو..و ڕۆشنبیر بوو. لەئاست کەسانی زاناو ڕۆشنبیران لەپرسیارو وەڵامیان دانەدەما. ڕێزی مەلای ڕەشی زۆر دەگرت. بۆ وێنە:

(جارێک مەلای ڕەش لەماڵەوە بۆ حوجرە دەچێت و قاسمی کوڕی ئەوسا مێردمنداڵ بوو لەگەڵی دەبێت. خوالێخۆشبوو ئاماژە بۆ قاسم دەکات دەنگ نەکات،

کە ئەو هاتووە. عەباکەی مەلای ڕەش لەزەوی دەخشا، حاجی ناوبراو لەدواوە عەباکەی بۆ هەڵدەگرێت.

مەلای ڕەش مرۆڤێکی باڵاکورت و ئەویش زۆر درێژ هەتا دەگاتە حوجرە بۆی هەڵدەگرێت.



جارێك لەکۆڕێکی قەرەباڵغدا دەگوترێت: (مەلای ڕەش تەڵاق نایەخێت).

ئەویش بەرپەرچی دەداتەوەو دەڵێت: (لەوەتی هاتووەتە مورتکە دوو تەڵاقی هاتووەتە لا هەردووکی خستووە).

راستە مەلای ڕەش زۆری ڕق لە تەڵاق خواردن دەبووەوە. هەتا لەدوبێڵی بهات بووایە تەڵاقی نەدەخست. ئەگەر چیشی بۆ نەکرا بووایە دەیگوتە تەڵاق خۆرەکە: (دەستت لەهەمبانە بەربووە). ئەوجا جوێنێکی زۆر ناشیرینی وای پێدەدا بێزی لێدەکراوەو کەڵکی سەر کاغەزی نییە.



# چارەی چاوی و.. وەفاتی

مەلای ڕەش چاوی تووشی ئاوی سپی بوو. دوو جاریان بردە شاری موسڵ و لای دکتۆر (عەبدولقادر جەوادی)هەر جارێ دەیگوت:

– (هێشتا ئاوەکەی ماوە عەمەلیات بکرێت).

هەرکە چاوی تەواو گەیشت عەزیزی کوڕی ساڵی (١٩٥٧) بردی بۆ شاری سلێمانی. دکتۆرێکی ئینگلیز تازە هاتبوو. لەچایەخانەیەك دابەزین ئیستراحەت بکەن. بەڕێکەوت مامۆستا مەلا (حەمید)ی مامۆستا مەلا ئیسماعیل دیبەگە ئەوسا لەشاری سلێمانی مامۆستای ئامادەیی بوو، لەگازینۆکەدا تاولەی دەکرد. عەزیز پێی شەرم بوو دەنگ بکات. بەس بەچایەچییەکەی گوت: (ئێمە فلانین، دوای ڕۆیشتنمان بە مامۆستا بڵێ).

چایەچییەکە دەستنیشانی ئوتێلێکی بۆ کردن‌و عارەبانەکیان گرت بۆ ئوتێلەکە چوون.

زۆری نەبرد گەیشتە لایان‌و دەستی بەگازاندان کرد ئاگاداریان نەکردووەو گوتی:

- مامۆستا ئوتێل جێگەی جەنابت نییەو دواڕۆژ بۆ مەلاکانی سلێمانی دەبێتە عەیب‌و شوورەیی. بەم قسەیە سەلماندیان‌و لەگەڵی چوونە مزگەوتی (مەولەوی)، خوالێخۆشبوو..و پایەبەرز مامۆستا (مەلا عەبدوڵلای چروستانی) ئیمامی مزگەوتەکە بوو. کاتی خۆی ناوبراو لای خوێندبوو. جارێکیش سەردانی کرد لەئاوایی چەغەمیرە.

یەکجار زۆر ڕێزی لێنان، حورمەتێکی وا هەتا دنیا دنیایە لەیاد ناکرێت. عەزیزی سێ ژەمە دەبردەوە ماڵەوە بۆ نان خواردن. مامۆستا مەلا حەمیدیش بۆ ماڵەوەی دەعوەت کردن.



عەزیز هەر جارێ لەنێو شاری سلێمانی بسووڕا بووایەوە: پۆل پۆل مەلاو فەقێی دەدیت‌و گوێی لێیان دەبوو: (ئەڵێن: مامۆستا مەلا ئەحمەیی ڕەش هاتووە ئەچینە خزمەتی).

لەمزگەوتی مامۆستا مەلا عەبدوڵلا بوون چەند فەقێ‌و مەلا دانیشتبوون، کوڕی موفتی سنەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان (بەداخەوە ناوەکەی لەیاد نەماوە) عیبارەتی کتێبێکی بەدەستەوە بوو، بە زۆربەی مەلاکانی سلێمانی نیشاندابوو قەناعەتی نەهاتبوو، لەوکاتەدا لە مەلای ڕەش دەپرسێت:

مەلای ڕەش گوتی: (من چاوم نییە بۆم بخوێنەوە).

فەقێکە بۆی خوێندەوە. جاری دووەم‌و سێیەمیش داوای خوێندنەوەی لێکرد. بە سێ جار بیستن هاتەبەری‌و نزیکەی دوو دەقیقە بیری لێکردەوە گوتی: (کوڕ باوکم لەنێوان فلان کەلیمەو فلان کەلیمە (إلاّ)یەك نوقسانە).

ئەوسا کوڕی موفتی گوتی: (مامۆستا تازە من پێویستیم بە ماناکە نەما).



لـەکاتی عەمـەلیاتی چـاوی مامۆسـتای تایـەن لـەدیاری وەسـتا. دوو سـێ ڕۆژ لەنەخۆشخانە مایەوە. هەموو ڕۆژ سەردانی دەکرد.

هەرکە دکتۆر گوتی: (بیبەنە دەرەوەو بەس دەبێ دوو سێ ڕۆژان بێتـەوە دەرمـانی تێدەکەم).

ئەوسا لەسەر داوای زۆربەی مەلاکان، چووە مزگەوتی (کاکە ئەحمەدی شێخ).

مزگەوتەکـە ئێـواران پـڕی مـەلا دەبـوو. هـەموو ئێـواران مامۆسـتا مـەلا عەبـدوڵڵا دەهات:

دوو ڕۆژ دوای تەداوی تووشی پشوو سواری بوو. وازەین دەبـردرا لەبەرئەوە بـوو عەمەلیاتەکـەی چـاوی نەجاحـەتی نـەهێنابوو. لێیکـردە نەخۆشـی دڵ. بـەیانی ڕۆژی سێیەم بە عەزیزی گوت: (ببمەوە). هەرچەندە مەلایەکان، بەتایبەتی جەنابی مامۆستا مـەلای عەبـدوڵڵا فـەرمووی: (هـەر ئـەمڕۆت دەرمـان مـاوە، نەیسەلماندو گـوتی: (تـازە چاوم بۆ چییە، من دەمرم، جا با بگەمـەوە نـاو منداڵەکانم). ئیتر هاتینـەوە. لـەڕێگادا سات بە سات نەخۆشییەکەی تونـدتر دەبـوو..و لەحاڵـەتی شڕیدا بـوو. بۆیـە لەشـاری کەرکووك لایاندا ماڵی پووری عەزیز. تاکو تۆزێك ئیستراحەت بکـات. هەرکە گەیـشتە ماڵەکـەو پێڵاوێکـی لـە پـێ کـردەوەو دووەمـی پـێ لـە پـێ نـەکراوەو بـەپێوە گیـانی لەدەست دا.

عەزیز لەتاوی مردنـی ئاگای لە هیچ نەماو پوری تۆڕمبێلی گرت و کفنی کڕی و لەگەڵ (حاجی ڕەحمانی پوورزا)ی عەزیزو پووریو کچەکەی جەنازەکەیان هێناوە.



لەدوای بەڕێکردنی جەنازەکە بۆ ئاوایی مورتکە خوالێخۆشبووان (حـاجی عـەولای نەبیاوەو مەلا ئەحمەدی (گۆمەگڕوو) هاتن).

خوالێخۆشـبووان (مامۆسـتا مـەلا عومـەری ڕەش و حـاجی موحەمـەد نـەجاڕی دۆستیان، لە کەرکووك گازەندەیان کردبوو خەبەریان نەدابوونێ. خوالێخۆشبوو عـەلی ئاغا دەیانگوت بۆ باوکی خۆی نەگریاوە. سێ جار گوتی: (وەیڕۆ.. کاکەڕۆ).

مامۆستا مەلا ئەحمەدی گۆمەگڕوو، مەلای گوندی نەبیارە بوو کە بەهاوار هاتبوو.. موجازی مەلای ڕەش بوو. پێش ئەوەی تەلقین بخوێنێتەوە عەلی ئاغا پێیگوت:

- مامۆستا پێویستی بە تەلقین هەیە؟.

ناوەڵڵا پێویستی پێ نییە. دەبێ من کە فەقێی ئەوم دەرسی پێ بڵێم. بەڵام ئوسولێکی شەرعیەو دەبێ بەجێی بگەیەنین.

لە تەلقینەکەدا گوتی: (ئەی مامۆستا، ئەی مامۆستا).

ئاغای ناوبراو لەسەر قەبران گوتی:

- یەك مەلای ڕەش هاتە لای من ئێستاکە پێنج مەلای ڕەشە. مەرامی هەر پێنج کوڕەکەی بوو.



نزیکەی حەوت ڕۆژ میوانیان هات. بەتایبەتی مەلا ناودارەکانی شاری هەولێرو دەوروبەری و شاری کەرکوك. مەسرەفی تازییەکە گشت لەسەر عەلی ئاغا بوو..و نیوەڕۆیەك دۆڵمەیان ئامادە کردبوو، ڕێزدار جەنابی خوالێخۆشبوو مامۆستا (مەلا عەبدوڵڵای چڕۆستانی) لەشاری سلێمانی ڕاهات. عەلی ئاغا یەکسەر جەوابی بۆ ماڵەوە نارد: (جەنابی مەلا عەبدوڵڵای چڕۆستانی هاتووە دۆڵمەکەی بە برنج و ترش بگۆڕن).

مەلای ڕەش دوای خۆی پێنج کوڕو سێ کچی بەجێ ماون.



## ئیمامی شافعی دووەم

مەلای ڕەش نەك لەکوردستانی ڕۆژهەڵات و باشوور بەناوبانگ بووە، بگرە لەکوردستانی باکوور بە ئیمامی شافعی دووەم ناودار بووە.

ڕۆژێـك دوای وەفـاتی بـاوکم چـوومە سـەردانی ڕێـزدار مـەلا سـالحی مـەلا ڕەشـیدی سـکرتێری بـاوکم، لـەحوجرەی خوالێخۆشـبوو..و پایەبـەرز مامۆسـتا (مـەلا سـالحی کۆزەپانکە)ی دەخوێند. فەقێیـەکی کوردستانی گۆڕین لەهـەمان حـوجرەی دەخوێـند. هەرکە دانیشتم مەلا سالح ڕووی لە فەقێیەکەی کردو گوتی:

- (ئەوە کوڕی ئیمامی شافعی دووەمە).

ئـەویش زۆری هەوەسـت پێهـات و چـاك و چـۆنیەکی گـەرم و گـوڕی لەگـەڵ کـردم و فەرمووی: (زۆر خۆشحاڵم بە ناسینت)- نووسەر



# چاکە

لەژێر چاکەی خوالێخۆشبوو حاجی حوسێن مەیاس بەسەر بنەماڵەکەمانەوە هەتا ڕۆژی حەلاوەلایی دەرنایێن:

دایکم لەکاتی گرانییە کە وەفاتی کرد. (دەبە)ی بـەنزین ئەوسا بە چل دینـار بوو. پارەش یـەکجار زۆر کـەم بـوو. خزمـەکان پێیـان گـوتم: (گرانییـەو ڕەوانیـە جەنازەکـەی ببەیتەوە گوندی..).

منیش گوتم: دایکم بێ برا بووەو باوکیشم خەڵکی ناوچەکە نەبووەو سی و سێ ساڵ بەیەکەوە ژیـاون، تـۆ خـوا حـەیف نییـە جەنازەکانیان لەیـەك دابـڕێنم. بەحـەقی خودا خانووەکەشم لەسەر دانابێت دەیبەمەوە مورتکە.

باوکم ساڵی (١٩٥٧) لەگۆڕستانی ئەم ئاواییە نێژراوە.

جوابم بۆ خوالێخۆشبوو حاجی ناوبراو ناردو گوتم:

- دایکم وەفاتی کردووەو دەیبەینەوە گوندی.

جوابی یەکسەر ناردو گوتی:

- ئێوە حەقتان بەسەر چییەوە نەبێت و هەمووی عائیدی منە.

بۆ ئەوەی باوەڕمان بێت کۆستەرو پێکابێك پڕ زەلامی قەبر لێدەری هێنا پێش ماڵمان و فەرمووی:

– ئەنگۆ بەس جەنازەکەی بشۆن و بێنن. ئێمە وادەڕۆین. هەتا جەنازەکەمان شۆری و بردمان گۆڕەکەیان تەواو کردبوو.

چل تورمبێلی بەدواکەوت. بێ ئەوەی فلووسێکم بچێت. ئیتر دڵم لەم ڕووەوە داکەوت.. نووسەر.



# هێندێك لەواریقاتەکانی

## ١- سۆفی ڕەسووڵ

خوالێخۆشبوو (سۆفی ڕەسووڵ) بن عامی مەلای ڕەش دەبێت شەوان لەمزگەوت دەماوەو خواپەرستی دەکرد.

مەلای ڕەش بەپێچەوانەی فەقێیان ئێواران زوو دەنووست. هەرکە فەقێکان بەدەورو سەعی کردن هیلاك دەبوون دەنووستن، ئەوجا هەڵدەستاوەو سەعی دەکرد.

شەوان لەگەڵ مام ڕەسووڵ، تا نزیك بەیانی بەیەکەوەیان بەسەر دەبرد. (بەداخەوە ناوی مزگەوتەکە لەیاد نەماوە.. نووسەر). هەرکە وەختی خەویان دادەهات سۆفی ڕەسووڵ ڕووی تێدەکردو دەیگوت:

– ئەریٚ ئەحمەد تۆ بۆ ناخەویت؟.

ئەویش دەیگوت:

– مامە بەسەرت قەسەم هەرکە ڕیشە گەورەکەت دەبینم یادی ڕیشی (سابرێن)ێکی خۆمان دەکەمەوەو نایەڵێت بخەوم.

ئەوسا ڕاوی دەناو دەیگوت:

- (پەپکەقیر شەرت بێ داری مردووت لەسەر سک دابنێم). ئەویش خۆی دەشاردەوەو بەیانی بانگی دەکردو تمەنێکی لەمست دەنا.

(پارەکە لەبیر کراوەو من کردوومە بە تمەن.. نووسەر).



## ٢- گونی کاکت بوو

جارێك مەلای ڕەش، لەکاتی فەقێیاتیدا، بۆ خوێندن دەچێتە حوجرەی شارێك لەشارەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان: (بەداخەوە ناوی شارەکە لەیاد نەماوە.. نووسەر).

فەقێیکان پێیدەڵێن: (ئێمە لەژیانی خۆمان زۆر بێزار بووینە).

مەلای ڕەش وای بۆ دەچێت گوزەرانی ژیانیان باش نەبێت‌و دەڵێت:

- بۆ..؟

- ئێمە لەئێوارێوە بەدەورو سەعی کردن، تابەترێکی شەو، خەریك دەبین، دوای تۆزێك نووستنمان، پێش بەیانیدان (سۆفی)یەك هەیە شەو بێر ناکات‌و دێت یەکە یەکەمان لەخەو دەکات‌و دەڵێت:

- فەقێینە هەستن خەونم دیتووەو تەعبیرم بۆ لێدەنەوە.

ئەویش دەڵێت:

- ئەگەر ئەم شەو هات بۆ لای منی بنێرن.

سۆفی هەروەکو جاران فەقێکان بەخەبەر دێنێت‌و لێکرا دەڵێن:

- فەقێ (ئەحمەد)ێك تازە هاتووە ئەو لە تەعبیری خەونان زۆر لە ئێمە چاکتر دەزانێت.

یەکسەر دەچێتە لای‌و دەڵێت:

- فەقێ ئەحمەد لەخەودا لاموا بوو لەئاسمانان دەگەڕام.

ئەویش بەشێوەیەکی ئاساییەوە پێیدەڵێت:

- مام سۆفی ئەوەی جەنابت بەناو خەونە لەڕاستیدا زۆر زۆر پیرۆزەو ئەگەر شتێکی لەگەڵدا بێت مسۆگەر بەکەرامەت دادەندرێت و تۆش وەلییەکی لەوەلییەکانی خوای گەورە.

بەحەیرمانەوە دەڵێت:

- شتی چی..!؟.

- ئەگەر لەکاتی سەرکەوتنت بۆ ئاسمان سەرت بەشتێکی نەرم کەوتووبێت کەرامەتە. ئەگەر نا خەونی جڕناو فڕنایە.

باش بیرکردنەوەو دامێکی زۆرەوە دەڵێت:

- نازانم.

- مام سۆفی زۆر باش بیر بکەوەو بینەوە یادت. ئەگەر وابێت باوەڕ بکە تۆ پیاوێکی نوورانیت و دەبێ من دەستەکانت زیارەت بکەم.

سۆفی سەر بەخۆیدا شۆڕدەکاتەوەو تەواوێك دادەمینێت، پاشدان دەڵێت:

- ئەگەر لێم نەبێتە درۆ تازە دێتەوە یادم سەرم بەشتێك کەوت.

- مام سۆفی بە قوربان: پێمگوتی: گۆترە نییەو چاك بەبیرە خۆت بێنەوە.

بەزەردەخەنەوە:

- بەڵێ، بەڵێ تەواو بیرم هاتەوە: سەرم بەشتێکی نەرم کەوت.

- مەعلووم.

- قاتی بەو ڕیشە سپیەمەوە درۆت لەگەڵ ناکەم.

- با پێت بڵێم: شتە نەرمەکە (گون)ی کاکت بوو. من ئەوەندە لەسەرەوەی تۆ بووم.

ئیتر لەو ڕۆژەوە سۆفی بیرای بیر تخوونی فەقێیان نەکەوتەوە.



## ٣- ساڵی گرانی

ساڵی (١٩١٦-١٩١٧) گرانی دەبێت و نان زۆر زەحمەت پەیدا دەبوو. مەلای ڕەش ئەوسا موستەعید دەبێت و بەخۆ..و سێ چوار سوختەوە بۆ خوێندن دەچنە دێیەك (بەداخەوە ناوی گوندەکە لەیاد کراوە).

مەلای ئاواییەکە دەڵێت:

- جێگا هەیە، بەڵام نان نییە. مەگەر بە خەڵکی دێیەکە بڵێیت: ڕۆژانە نانتان بۆ ببرنەوە.

ئەویش ڕیش سپی و جوامێری گوندەکە خڕ دەکاتەوەو پێیان دەڵێت:

هەریەکەیان بە قەدەر توانا ئەوەندەیان نان بۆ دەبرنەوە بەشی ئەوان زیاتر بکات.

لە سێیەم ڕۆژدا نانی (کوێخا کەریم) ناوێك دەبڕێت.

مەلای ڕەش هەرکە وێدەکەوێت: کوێخای تایەن ژنەکەی لەماڵەوە بەسەریدا زاڵەو بێ ئەو ناتوانێت ئەو تەرحە کارانە ئەنجام بدات.

ڕۆژێك کوێخا گوڕین لەماڵ نابێت، مەلای ڕەش بەدەرفەتی دەزانێت و فەقێیەك دەنێرتە لای (زولێخا)ی خێزانی کوێخای ناوبراو دێتە میوانی.

مەلای ڕەش دەبینێت ژنێکی جوان و قۆزو بەهەیکەلەو ئەملاو ئەولای باسکی پڕ بازنی زێڕەو قوتووە، جگەرەی دەفتەری پێچراوی لەپێشە، پێی سەرسام دەبێت.

پاش لەبەر هەستان و بەخێرهاتنێکی گەرم و گوڕەوە، جگەرە پێشکەش کردن و دەڵێت:

- مەلای ڕەش نەتدەزانی تاکو من هەبم کوێخا کەریم چ حسێبێکی بۆ ناکرێت.

ئەویش یەکسەر دەڵێت:

- خانم هەزار شێری نابەڵەد بەقوربانی ڕێوییەکی بەڵەد بێت.

هەرکە ئەمەی لێ بیست بەوپەڕی خۆش گوراحیەوە گوتی:

- مەلای ڕەش هیچم لەبەر دڵ نەماو بڕیار بێت، هەتا ماوم لەژیاندا ئەو نانە بۆ فەقێیان بەردەوام بێت.

ئیتر لەو ڕۆژەوە بە (کوێخا زولێخاو کوێخاژن کەریم) ناودەبردران.



## ٤- سونەتی موئەککەد

کابرایەکی خەڵکی ئاوایی (چەغەمیرە)، (ناوهێنانی پەسند نییە) بە مەلای ڕەش دەڵێت: (من سونەتی موئەککەدە جێبەجێ دەکەم: کیژی خۆم لۆ خۆم بەژن دەدەم).

گوێدرێژێکیشی هەبوو بیستو چوار سەعات بەرەڵلای دەکردو زەرەرو زیانی بە بەرهەمی کشتوکاڵی خەڵکەکەی دەگەیاند.

مەلای ڕەشیش پێیدەڵێت:

- ئەو سونەتە موئەککەدەی مەکەو واجیبێك هەیە لە سونەت لەپێشترە بیکە.
- چییە؟.
- کەرەکەت تێرکەو بیبەستەوە.



## ٥- کەر بەگوێ دەناسم

خوالێخۆشبوو (حەمید)ی برای (مەلا عومەر)ی مەرزانی گوندی (گەزۆك)ی ناوچەی قەراج، لەکۆنەوە دۆستی ماڵی مەلای ڕەش بوونە، لەعەسکەری حکومەتی عێراق فیرار دەکاتو کەلوپەلی عەسکەرییەکەی بە ئامانەت دەباتە ماڵی مەلای ڕەش لەدێی چەغەمیرە.

ئێوارەیەك عەزیزی کوڕی لەبەری دەکات. هەرکە مەلای ڕەش لەنوێژی مەغریب دەچێتەوە ماڵ، بەرەو پیریەوە چوو..و دەستی ماچ کرد. لەبەر دنیا تارێکی نەیناسیو گوتی:

- بەخێر بێت کوڕ باوکم.

هەرکە عەزیزی بەهۆی پێکەنینەوە ناسی، منداڵەکان لێکڕا گوتیان:

- نەتناسی.

ئەویش گوتی:

- کە پشتی تێکردمو گوێیەکانم دیتن ناسیم. چونکە کەر بە گوێ دەناسم.



## ٦- ئیبنو حەجەر(١)، ئیبنو خەنجەر

کابرایەکی عەشیرەتی شێروانی ئاوایی (چیغلۆك) لەگەڵ خوالێخۆشبوو: (موسا عەلی)ی گوندی چەغەمیرە. شکایەت لەیەکتر دەکەن. ئەمەیان توند تەبیعاتو لەسەر بوو.

مەلای ڕەش پاش گوێ لێراگرتنیان دەڵێت:

- ئەگەر بە ئیبنو حەجەری دەڵێیت هی شێروانییە، خۆ ئەگەر بە ئیبنو خەنجەریش دەڵێیت هی موسایە.



## ٧- تۆ ببە کوڕی من

پیاوێکی بەختیاری ئاوایی چەغەمیرە لەدەوری حەفتا ساڵدا دەبوو..و پێنج فەرزە لەدوای مەلای ڕەش نوێژی بەجەماعەت دەکرد.

ڕۆژێك جاشکێکیماڵی مەلای ڕەش دەچێتە سەر جۆخینی ماڵی ناوبراو لەدەرکردنیدا خەنجەرێکی لێدەدات. ئەوسا ئەو تەرزە کارە بە ئیهانە لەقەڵەم دەدرا. کەریش ئەو ڕۆژە زۆر بەرەغبەت بوو. مەلای ڕەش زۆر حەلیم بوو..و بەهیچ جۆرێك تووڕە نەدەبوو. لەجیاتی سەرکۆنەکردنی پێیدەڵێت:

- فلان تۆ لەمەودوا ببە کوڕی منو (بەهیە)ی خێزانم دایکتو کوڕو کچەکانم خوشكو براتن.

ئەویش زۆری هەوەست پێدێتو هەتا مردیش دەیگوت:

- بڕیار مامۆستا بۆرە مارەییەکی لەسەر دایکمی هەبووایە.

خەڵکی ئاوایی کارەکەیان زۆر لا نارەوا دەبێتو پێیان خۆش بوو مەلای ڕەش ریسوای بکاتو پێیدەڵێن:

- مامۆستا چت لە فلان کرد؟.

- کردم بە کوڕی خۆم.

1- ئیبنو حەجەر: کتێبێکی گەورەی شەرعی ئیسلامە.

بەحەپەسانەوە دەڵێن:

– ئەوەی جەنابت دەفەرموویێت کابرا هەتا لەژیاندا ماوە شانازی پێوەدەکات.

– ئێوە خراپ حاڵی بوونە. هیچ کەس لەخوێڕیاتی ناگاتە کوڕە مەلایان تەنیا ئەو پیاوە نەبێت. بۆیە بە کوڕی خۆم قەبووڵ کرد.



## ٨- بۆ نان هاتوومە

لەساڵی (١٩٤٧-١٩٤٨)دا گرانی دەبێت. واتە لەدەشتی هەولێر دەغڵو دان باش نابێت. عەڵبەی گەنمی گەیشتە (٣٢) سیو دوو دینار. ئەوسا ئەو پارەیە بەهەوەنتە پەیدا نەدەبوو.

مەلای ڕەش باراشی نامینێتو دەچێتە لای خوالێخۆشبوو (کانەبی ئاغا)ی گوندو دەڵێت: (ئاغا باراشمان نەماوە).

ئاغاش لەسەر کورسی دانیشتبوو، بەڕوو گرژییەوە پشتی تێدەکات.

مەلای ڕەش یەکسەر دەڵێت:

– ئاغا من بۆ نان هاتوومە، بۆ گان نەهاتوومە قوونتم تێدەکەیت.

ئاغاش هەرکە ئەمەی گوێ لێدەبێت ڕوو لە خزمەتکارەکەی دەکاتو دەڵێت:

– کوڕە بڕۆ نیو عەڵبە گەنمی گانی بۆ ببە.



## ٩- ئاسیاخان

ڕۆژێک خوالێخۆشبوو (ئاسیاخان)ی تاکە کچی ئاغای گوندی جەواب بۆ مەلای ڕەش دەنێرێت: (دووعایەکی خێرم بۆ بکات).

ئەویش لەمەرامی دەگاتو دەڵێت:

– (مەنیشە وەبار نووشتەی مەلاوە، بنیشە وەبارکاری خواوە).

ڕۆژێك خوالێخۆشبوو كانەبی ئاغا چەند میوانێكی دێن و لەسەر سەكۆی دیوەخان دادەنیشن. مەلای ڕەش بە هەل دەزانێت و ڕووی تێدەكات و دەڵێت: (ئاغا بۆ ئاسیای كچت بە مێرد نادەیت؟).

ئەویش بە حەپەسانەوە دەڵێت: (مامۆستا خۆ بەخۆم ناگەڕێم، نابێت یەكێك بێتە داخوازی).

– تۆ دەتەوێت بیدەیتە كوڕی مەعروف ئاغای باقرت و جوكل ئاغا، ئەوانەش نایانەوێت.

– ئەدی بیدەمە كێ؟.

– بەگوێم من دەكەیت: وەرە بیدە میرزای ڕەسووڵ ڕۆستەمی خزمەتكارت.

– حكۆ.. مامۆستا ئەتوو هەموو قسان دەكەیت!.

– ئاغا واجیبێكی شەرعی سەر شانم بوو پێمڕاگەندوویت و كەیفی خۆشتە.



## ١٠- بەس من مەخۆ

ڕۆژێك خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا (ئەبووبەكر)ی دووگردكان میوانی مەلای ڕەش دەبێت لەبەرئەوە لای خوێندبوو یەك ماڵ بوون. نیوەڕۆ پلاوو برنج بەگۆشت مریشكی بۆ ئامادە دەكەن. لەبەر ئەوە یەكجار زۆر خۆر بووە، هەرچی لەپێشی دەبێت خلاسی دەكات و ئەوجا ڕوو لە مەلای ڕەش دەكات و دەڵێت:

– مامۆستا چ نەما من بیخۆم.

ئەویش بەزەردەخەنەوە دەڵێت:

– بابە هێشتا زۆر ماوە بیخۆیت: ئەوە قاپەكە، ئەوە سینیەكە، ئەوە خێزانەكەم، ئەوە منداڵەكانم بەس من مەخۆ.



## ١١- لەگەڵ تۆم نییە

ئیجازەیەکی مەلایەتی لەئاوایی چەغەمیرە دەدرا. (بەداخەوە ساڵەکە لەیاد نەماوە.. نووسەر)، (٩) نۆ موستەعیدی خوالێخۆشبوو: مامۆستا مەلا (ئیسماعیل)ی دیبەگە کتێبی (جەمعولجەوامیع)یان دەخوێندو لەئیجازەکە بەیەکەوە دادەنیشتن.

خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا (ئەبووبەکر)ی دووگردەکان ڕوویان تێدەکات و دەڵێت:

- ئێوە هەر نۆتان موستەعیدی مەلا ئیسماعیلن؟.
- بەڵێ.
- چیدەخوێنن؟.
- جەمعولجەوامیع.
- پرسیارێکتان لەو کتێبە لێ بکەم؟.
- فەرموو:

هەرکە پرسیارەکەیان لێدەکات شتاقیان نازانن. ئەوسا دەڵێت:

- دڵگیر مەبن، مامۆستاکەشتان نازانێت.

لەو ساتەدا مەلای ڕەش دەگاتە لایان و دەڵێت:

- مەلا ئەبووبەکر پرسیارەکەت چی بوو؟.

بەتەوازووەوە دەڵێت:

- مامۆستا چاوەکەم لەگەڵ تۆم نییە.



## ١٢- تۆ لە من عالم تری

خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلاساڵحی کۆزەپانکە لە مەلا هەرەباشەکانی شاری هەولێر بوو. ڕۆژێك بە مەلای ڕەش دەڵێت:

- جێگایەك لەكتێبی (شەرحە عەقائیدی مەلا جەلال) هەیە هەفتەیەكە تەماشای دەكەم ماناكەیم بۆ نایەت.

ناوبراو بەبێ موبالاتییەوە دەڵێت:

- شەرحە عەقائیدی مەلا جەلال كوڕی خۆمەو بۆم بخوێنەوە.

ئەویش بەوەڵامەكە زۆر هەڵدەچێت و لەگەڵ ڕەوانە كردنی كلكی كۆچانەكەی دەستی بۆی دەڵێت:

- ئەوەندە خۆت هەڵمەكێشە: ئەمن دەڵێم هەفتەیەكە سەیری دەكەم نایزانم تۆش دەڵێیت: كوڕی خۆمە.

- تووڕە مەبە جێگاكەیم نیشان بدە.

- هەركە دەستنیشانی بۆ دەكات و دەڵێت:

- بەسەری ئەو مەلا ساڵحە حەفتا كەڕەت ئێرەم گوتووەتەوە.

بۆی شەرح دەكات و ئەویش ئەوسا پڕەداتە ماچ كردنی دەستی و دەڵێت:

- ئەشهەدو بیللا تۆ لە من عالم تری.



## ١٢- خۆ نەمگابوویت

مەلایەك لەدەوروبەری هەولێر: (ناوهێنانی هەموار نییە) كاتی خۆی فەقێی مەلای ڕەش بووە، پاش چەندین ساڵ ڕۆژێك لەموناسەبەتێكدا، بۆ ئەوەی بەشكاندنەوەی مەلای ڕەش، مەلایەتی خۆی لەمەجلیسەكە دەربخات، ڕووی تێدەكات و دەڵێت:

- مەلای ڕەش كاتی خۆی لەكتێبی (موتەوەل) فلان جێت بە من گوت: ئەوكات من عەقڵم شەرحەكەی تۆی نەگرت، بەڵام ئێستا دەزانم: نەتزانیوە.

ئەویش یەكسەر دەڵێت:

- ئەوسا خۆ نەمگابوویت بۆ دەنگت نەكرد.

پاشدان پێیدەڵێت:

- مادام هێندەت ڕا لەخۆیە، لەفلان جێی کتێبی (سیوتی) (ئەبووتالیب)ێك هەیە، ئەوا سێ ساڵم ئیزن دایت ماناکەیم بۆ بڵێیت.

ئیتر مەلاکە لەمەجلیسەکە نەك فەشەل دەبێتەوە، بگرە بەسەر خۆشیدا شکاوە.



## ١٤- مەلای سەرگەڕ

ڕۆژێك مەلای ڕەش لەحوجرە، بە فەقێیەك جەواب بۆ ماڵەوە دەنێرێت: (مەلای سەرگەڕ میوانە). بەگوندی (سەرگەڕان)ی دەگوت: (سەرگەڕ).

خێزانەکەشی زۆر ڕێزی هێندە پیاو ماقووڵانی ناوچەکە دەگرت. یەك لەئەوانە: خوالێخۆشبوو مامۆستا (مەلا تاهیر)ی سەرگەڕان بوو. بەقسەکەی مریشك دەکوژێتەوەو بەپڵاو برنجی لێدەنێت.

مەلای ڕەش کە نیوەڕۆ دەچێتەوەو کەسی لەگەڵدا نابێت مەلاژن پێیدەڵێت:

- ئەی میوانەکە؟

ئەویش لەگەڵ سەربادانی بەملاو بەولادا دەڵێت:

- ئەوە مەلای سەرگەڕ.



## ١٥- شێخ ئیسماعیل بەرزنجی

خوالێخۆشبوو: (شێخ ئیسماعیل شێخ عەبدولکەریمی بەرزنجی)، ڕۆژێك بەخۆ..و چەند دەروێشێکەوە دەچنە ئاوایی چەغەمیرەو ڕوو لە مەلای ڕەش دەکات و دەڵێت:

- مامۆستا دووعام بۆ بکە ببمە شێخێکی باش.

مەلای ڕەش دەڵێت:

- دوو شتت لێ بێتە دی دەبیتە قوتبی ڕەببانی.

بەسەرسوڕمانەوە دەڵێت:

- چین ئەو دوو شتە!؟.

- یەکەم: لە فیشالآن قەت مەپەنگیوە.

دووەم: ناوە ناوەش بە پاشەڵ ئیحتاجی خەڵك جێبەجێ بکە.

شێخ ئیسماعیل لەقاران شێت و هار دەبێت و بەڵام مەلای ڕەشەو چی لەگەڵ ناکرێت.

پاشدان مەلای ڕەش دەڵێت:

- ئێمە سەرجەلەیەکمان دەچێتەوە سەر سەیدان. من لەهەوەلەوە باوەڕم نەدەهات. کەچی ئێستا دەلیلێکی زۆر بەهێزم لایە کە من سەیدم.

- پێم ناڵێیت چییە!؟.

- بە منداڵی زۆرم حەز لە(.........) بوو.

شێخ ئیسماعیل تا لەسەر پشت کەوت پێکەنین بەری نەدا.



## ١٦- مریشکی حەبیبە

خوالێخۆشبوو (حەبیبە) بێوەژنێکی ئاوایی بوو (٩) نۆ مریشکی دەبێت.

ڕۆژێك (ئەبووبەکرو قاسمی مەلای ڕەش و عەبدوڵڵا حەسەن ئاغاو ئەبووبەکرو حوسێنی موحەمەد بندیان) حەبیبە لەماڵ نابێت و دەچنە حەوشەی، حەفت مریشکان دەگرن و سەریان هەڵدەکێشن و دێنە دەرەوە بانگ دەکەن: (هۆی.. گۆشت هۆی.. گۆشت).

خەبەری مەلای ڕەش دەدرێت و دەڵێت: (کوڕی من لەگەڵدا نەبووە).

- مامۆستا بەچاوی خۆمان بینیومانە: کەلەشی مریشکیان لەسەر شان بوو.

- من باوەڕم نایەت و دەلیلێکی زۆر گەورەم لایە دەستی کوڕی منی تێدا نەبووە.

خەڵکەکەش ناچار دەبن بڵێن: (پێمان نالێیت دەلیلەکەت چییە؟).

- ئەگەر دەستی کوڕی منی تێدا بووایە: دوو مریشکەکەی تریش نەجاتیان نەدەبوو.



## ١٧- مەیمونێکی وەك تۆ

(لازار) قائیمقامی قەزای مەخموور، زۆری مەراق بوو کێشەی نێوان ئاغاو جوتیارە ڕاپەڕیوەکانی ساڵی (١٩٥٣) بنبڕ بکات. ڕۆژێك بۆ ئەم مەبەستە لەکاتی دەعوەت کردنیدا لەدیوەخانی ئاغای چەغەمیرەوە ڕووی لە مەلای ڕەش دەکاتو دەڵێت:

- مامۆستا تۆ باش مەلای ناوچەکەیت بۆ ئەو گیروگرفتەی ئاغاو جوتیارەکان حەڵناکەیت.

ئەویش دەڵێت:

- تا مەیمونێکی وەك تۆ حاکم بێت بە من حەلناکرێت.

قائیمقام نەیتوانی بەرپەرچی بداتەوە.



## ١٨- مەلا مستەفای بێلنگە

خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا مستەفای بێلنگە، لەکوردستانی ڕۆژهەلات دەخوێنێت. پرسیارە دەکات کام مەلای باشە، تا بچێتە لای بخوێنێت. پێیدەڵێن: (خەڵکی کوێندەریت؟).

- کوردستانی عێراق.

- لەکوردستانی ئێرانو عێراق بگەڕێت، لە مەلا ئەحمەدی ڕەشی لای خۆتان باشتر نییە.

یەکسەر دەگەڕێتەوەو دەچێتە لای، لەگوندی دێمەکار.

لەبەر ئەوە گوندەکە ئاوی تاڵو سوێر بووەو لەوەرزی هاوینیش وشكو گەرم، بەخۆی دەیفەرموو: (ئێوارە بڕیارم ئەدا بۆ بەیانی بڕۆم کەچی هەرکە دەکەوتمە سەر دەرس پەشیمان دەبوومەوە).

جەنابی فەرمووی:

- خوالێخۆشبوو شێخ عومەری بالیسان ئیجازەی دەداو مەلای ڕەشیش هاتبوو.

شێخ عومەر ڕووی لە مەلای ڕەش دەکاتو دەڵێت:

- (ئێوە خەڵكی شاری هەولێرو دەوروبەری هەرچی هەتانە هی ئێمەیە). بۆ.. وێنە: (کاریتەتان هی ئێمە، شەقرەتان هی ئێمە، میوەتان هی ئێمە، تەرەتان هی ئێمە، ئاوتان هی ئێمەیە، بەفرتان هی ئێمەیە).

- پێم سەیر بوو مەلای ڕەش زۆر سەریعول جەوابە تائێستاش وەڵامی نەدایتەوە.

- پاشدان مەلای ڕەش هاتە وەڵامو گوتی: (ڕاستە ئەوانەی دەفەرموویت هەمووی هی ئێوەیە. تەنیا یەك شت هی ئێوە نییە.

شێخ عومەر واقی وردەمینێت کە، چ نەماوە تاکو شانازی پێوە بکاتو دەڵێت:

- چییە؟.

- عەقڵ.



## ١٩- بیبیسوو[1]

ڕۆژێك چەند پیاوێکی ناوداری ناوچەکە لای مەلای ڕەش کۆدەبنەوە، یەکێکیان زۆر زالمو بێدین دەبێت (ناوهێنانی پەسند نییە) ڕوو لە مەلای ڕەش دەکاتو دەڵێت:

1- بەداخەوە زۆر لەواریقاتەکانی فەوتانو ئەوانەی ئێرە نووسراون کەمێکنو لەزاری ئەمو ئەو وەرگیراون.. نووسەر.

– مامۆستا منیش دەڵێم خوا لێم خۆشدەبێت؟.

ئەویش دەڵێت:

– ڕاست دەفەرموویت. ئافرەتێك هەبوو ناوی (بیبیسوو) دەبێت کە دەچووە کوێستانان بەپێشەوەی ئیش دەکرد، لەگەرمیانیش پشتەوە. هەرکە دەکەوتە سەر سەجدەش دەیگوت: (خوایە خۆ من چیم نەکردووە، بۆ لێم خۆشنا بێت)، تۆش بیبیسوویت خوا بۆ لێت خۆشنابێت.



## ٢٠- مێژووی دروست کردنی مزگەوتی دێی ( پاشبەرد ).

مەلای ڕەش مێژووی دروست کردنی مزگەوتی گوندی پاشبەردی بەم شێوەیە، لە کۆڵەکەی مزگەوتەکەی نووسیوە:

(کلّ همّ وغمّ سینجلی).

ئەمەش بەحسێبی پیتی (ئەبجەد)ی ساڵی (١٣٠٤) هەزارو سێ سەدو چواری کۆچی دەکات.

ئەمڕۆش ساڵی ناوبراو (١٤٣١) و ئەمەش ناقیس (١٣٠٤) = (١٢٧). واتە سەدو بیست و حەوت ساڵە دروست کراوە.

بابزانین وایە:

پیتی ئەبجەدی بەم جۆرەیە:

(ابجد هوز حطي كلمن سعفص قرشت ثخذ ضظغ)

هەر پیتێك ژمارەی تایبەتی خۆی هەیە. فەرموون سەیری بکەن:

| پیتەکە | ژمارەکەی |
|---|---|
| ا= | ١ |
| ب= | ٢ |
| ج= | ٣ |
| د= | ٤ |
| هـ= | ٥ |
| و= | ٦ |
| ز= | ٧ |
| ح= | ٨ |

| | |
|---|---|
| ط= | ٩ |
| ي= | ١٠ |
| ك= | ٢٠ |
| ل= | ٣٠ |
| م= | ٤٠ |
| ن= | ٥٠ |
| س= | ٦٠ |

| | |
|---|---|
| ع= | ٧٠ |
| ف= | ٨٠ |
| ص= | ٩٠ |
| ق= | ١٠٠ |
| ر= | ٢٠٠ |
| ش= | ٣٠٠ |
| ت= | ٤٠٠ |

| | |
|---|---|
| ث= | ٥٠٠ |
| خ= | ٦٠٠ |
| ذ= | ٧٠٠ |
| ض= | ٨٠٠ |
| ظ= | ٩٠٠ |
| غ= | ١٠٠٠ |

(كلّ همّ وغمّ سينجلى)

١- وشەی (كل) بريتييە لە پيتی (ك.ل).

پيتی (ك= ٢٠ ژمارە)و پيتی (ل- ٣٠ ژمارە) كۆی ژمارەی وشەكە (٥٠) پەنجايە.

٢- وشەی (هم) لەپيتی (ه.م) پێك هاتووە.

پينی (ه=٥ ژمارە)و پيتی (م= ٤٠ ژمارە) كۆی ژمارەی وشەكە (٤٥) چلو پێنجە.

٣- وشەی (وغم) لەم پيتانە (و.غ.م) دروست بووە.

پيتی (و= ٦ ژمارە)، (غ= ١٠٠٠ ژمارە)و پيتی (م- ٤٠ ژمارە). كۆی ژمارەی وشەكە: (١٠٤٦) هەزارو چلو شەش.

٤- وشەی (سينجلی) ئەم پيتانە بە خۆوەگرتووە:-

پيتی (س- ٦٠ ژمارە)و پيتی (ی- ١٠ ژمارە)و پيتی (ن- ٥٠ ژمارە)و پيتی (ج= ٣ ژمارە)و پيتی (ل- ٣٠ ژمارە)و پيتی (ی- ١٠ ژمارە) كۆی ژمارەی وشەكە (١٦٣) سەتو شەستو سێ.

٥٠ + ٤٥ + ١٠٤٦ + ١٦٣ = ١٣٠٤.

## ناوەڕۆك:



مەلای رەش نەک لە کوردستانی رۆژهەلات و باشوور بەناوبانگ بووە.
بگرە لە کوردستانی باکوور بە ئیمامی شافعی دووەم ناودار بووە.
رۆژێک دوای وەفاتی باوکم چوومە سەردانی زێزدار
مەلا سالحی مەلا رەشیدی سکرتێری باوکم. لە حوجرەی خوالێخۆشبوو
و پایەبەرز مامۆستا «مەلا سالحی کۆزەپانکە»ی دەخوێند. فەقێیەکی
کوردستانی گۆرین لەهەمان حوجرەی دەخوێند. هەر کە دانیشتم
مەلا سالح رووی لە فەقێیەکەی کرد و گوتی: «ئەوە کوڕی ئیمامی شافعی
دووەمە».
ئەویش زۆری هەوەست پێهات و چاک و چۆنیەکی گەرم و گوڕی لەگەل
کردم و فەرمووی: «زۆر خۆشحالم بەناسینت». نووسەر

چاپخانەی گۆڤار - هەولێر